# دۆستایەتی و دژایەتی

# الولاء والبراء

# لە ئیسلامدا

نووسینی

هێمن عەبدولعەزیز

# دۆستایەتی و دژایەتی (الولاء والبراء) لە ئیسلامدا

نووسین و ئامادەکردنی: هێمن عەبدولعەزیز

**پێشەکی:**

إنَّ الحَمْدَ للهِ نَحْمَدُهُ وَنَسْتَعِينُهُ وَنَسْتَغْفِرُهُ وَنَعُوذُ بِاللهِ مِنْ شُرُورِ أَنْفُسنَا وَمِنْ سَيِّئَاتِ أَعْمَالِنَا مَنْ يَهدِهِ اللهُ فَلاَ مُضِلَّ لَهُ وَمَنْ يُضْلِلْ فَلاَ هادِيَ لَهُ وَأَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إلاَّ اللهُ وَحْدَهُ لاَ شَرِيكَ لَهُ وَأَشْهَدُ أَنَّ مُحَمَّداً عَبْدُهُ وَرَسُولُهُ.

يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا اتَّقُوا اللَّهَ حَقَّ تُقَاتِهِ وَلا تَمُوتُنَّ إِلَّا وَأَنْتُمْ مُسْلِمُونَ.

يَا أَيُّهَا النَّاسُ اتَّقُوا رَبَّكُمُ الَّذِي خَلَقَكُمْ مِنْ نَفْسٍ وَاحِدَةٍ وَخَلَقَ مِنْهَا زَوْجَهَا وَبَثَّ مِنْهُمَا رِجَالاً كَثِيراً وَنِسَاءً وَاتَّقُوا اللَّهَ الَّذِي تَسَاءَلُونَ بِهِ وَالْأَرْحَامَ إِنَّ اللَّهَ كَانَ عَلَيْكُمْ رَقِيباً.

يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا اتَّقُوا اللَّهَ وَقُولُوا قَوْلاً سَدِيداً، يُصْلِحْ لَكُمْ أَعْمَالَكُمْ وَيَغْفِرْ لَكُمْ ذُنُوبَكُمْ وَمَنْ يُطِعِ اللَّهَ وَرَسُولَهُ فَقَدْ فَازَ فَوْزاً عَظِيمًا.

أمّا بَعْدُ:

فَإِنَّ خَيْرَ الْحَدِيثِ كِتَابَ اللهِ وَخَيْرَ الْهَدْيِ هَدْيُ مُحَمَّدٍ "صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم" وَشَرَّ الْأُمُورِ مُحْدَثَاتُها وَكُلَّ مُحْدَثَةٍ بِدْعَة.

دۆستایەتی و دژایەتی (الولاء والبراء) بەشێکی بنەڕەتی ئەم ئایینەیە، بەڵکوو هێندێ لە زانایان دەڵێن هەموو تەوحیدو یەکخواناسی لە (وەلاء و بەڕاء) بەرجەستە دەبن، چونکە دەزانین نهێنی بە جێگەیاندنی کارە

بەندایەتییەکان بریتییە لە کارکردن بە دوو شایەتییەکە کە بەبێ گوتن و ڕەفتارپێکردنییان مە حاڵە بێیتە نێو بازنەی ئیسلامەوە، ئەوانیش بریتین لە گوتنی (لاَ اِلهَ اِلاَّ اللهُ مُحَمَّدٌ رَسُول الله).. ئەم دوو چەمکە ڕاستیەتی و (وەلاء و بەڕاء)مان پێ نیشان دەدەن کە لە هەردوو ڕستەی شایەتییەکە بەرجەستە دەبن.. چونکە لە گوتنی (لا اله) بەڕائەت و لە (الا الله) وەلائمان پێ دەناسێنێ.. کاتێکیش کە مەرجی هاتنە نێو ئیسلام بریتی بێت لە گوتنی ئەم دوو شایەتییە، ئەوە دەربڕینی وەلائە بۆ خواو خۆ بەری کردنە لە دوژمنانی.

بۆیە خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿فَمَنْ يَكْفُرْ بِالطَّاغُوتِ وَيُؤْمِنْ بِاللَّهِ فَقَدِ اسْتَمْسَكَ بِالْعُرْوَةِ الْوُثْقَى﴾ (البقرة: 256). واتە: ئینجا هەرکەسێك باوەڕی بە "تاغوت " نەبێت و باوەڕی بەخوا هێنا ئەوە بێگومان دەستی بە هەنگڵ و بەهۆکارێکی پتەوو قایمەوە گرتووە کە: (لاَ اِلهَ اِلاَّ اللهُ)یە.

سەیر بکەین دەبینین کە مەرجی خۆگرتن بە پەتی یەکخواناسی بریتییە لە کوفرکردن بە تاغوتان کە بریتییە دەربڕینی بەڕاء و دژایەتی بۆ ئەوان وچەسپاندنی وەلاء و دۆستایەتی بۆ خواو بۆ ئایینەکەی.

**کەوابوو: مسوڵمانان.. خوێنەرانی هێژاو سەنگین:**

دەبا وێکڕا چاوێك بە مەسەلەی دۆستایەتی و دژایەتیدا بخشێنین و بزانین کە چەندە لە ئیسلامدا پێگەی بەرزو بڵندەو چەندە لە ژیانی ئیسلامەتیدا توخمێکی بەهێز بووە بۆ چەسپاندن و جێگیر کردنی ئایین و بەرنامەی خوا، بەڵکوو چۆن هەمیشە بووەتە سەنگی مەحەك و لە هێڵەگ دانی مسوڵمانان، تا دەرکەوێت کە تا چەندە ئەو خەڵکە بۆکەڵکی جێنیشنێتی لە سەر زەوی بەکەڵك دێن و چەندە لە قەدەر ڕێزو پێزانینی خوادان کە فەرموویەتی: ﴿وَلَقَدْ كَرَّمْنَا بَنِي آدَمَ﴾ (الاسراء: 70). واتە: بێ گومان ئێمە ڕێزمان لە ئادەمیزاد ناوە. یان فەرموویەتی: ﴿كُنْتُمْ خَيْرَ أُمَّةٍ أُخْرِجَتْ لِلنَّاسِ تَأْمُرُونَ بِالْمَعْرُوفِ وَتَنْهَوْنَ عَنِ الْمُنْكَرِ وَتُؤْمِنُونَ بِاللَّهِ﴾ (آل عمران: 110). واتە: ئێوە (مسوڵمانان) باشترین گەلێك بوون بۆ خەڵکی هێنرابێتە دی فەرمان دەدەن بەچاکە وە جڵەوگیری دەکەن لە خراپە وە بڕوا دەهێنن بەخوا

خۆ ئەگەر ئەو کەسە لەم بۆتەی تاقی کردنەوەی دۆستایەتی و دژایەتییە دەربچێو سەرکەوتوو بێت باشە، دەنا

ئەگەر وا نەبوو هەرگیز نابێت بە خاوەن ئەو قەدرو ڕێزەی کە خوا بۆ ئەو کەسە دیاری کردووە، بەڵکوو ئەو دەم لە جێگەی ڕێزو حورمەتی خوا بە گوێدرێژ یان سەگ یان باقی ئاژەڵان حسێبی دەکات کە لە قورئاندا ئاماژەیان پێدراوە.

جا بۆ لایەنێکی گرنگی ئەم باسە حەز دەکەم بەر لەوە بچینە نێو وردەکارییەکان، سەرنجتان بۆ (22) خاڵان ڕابکێشم کە لەم دوو توێی کتێبی دۆستایەتی و دژایەتی (الولاء والبراء) لە ئیسلامدا ئاماژەم پێداون و نووسراوەکەم لە سەریاندا دابەش کردووەو باسم لێوە کردوون، کە بریتین لە:

**(1) بنجوبنەوانی (الولاء)**

**(2) بەڵگەکانی واجببوونی دۆستایەتی مسوڵمانان بۆ مسوڵمان:**

**(3) هەقە تایبەتییەکان:**

**(4) دژەکانی موالات:**

**(5) لەکەدارکردنی موالات:**

**(6) ئەوکەسانەی لەگەڵ موالات ناکۆکن:**

**(7) خۆ بەری کردن (البراء)**

**(8) پابەند بوون بەهەموو ئیسلام واجبە:**

**(9) دەربڕینی خۆ بەری کردن لە بێباوەڕان واجبە:**

**(10) پشتگیری کردن و یارمەتیدانی بێباوەڕان حەڕامە:**

**(11) کردنی بێباوەڕان بە نهێنپارێزو ڕاسگریی حەڕامە:**

**(12) ئەم حاڵەتانە چین کە دژ نین لەگەڵ ئەسڵی دۆستایەتی و دژایەتی (الولاء والبراء) لەگەڵ بێباوەڕان؟**

(13) دوژمن و ناحەزانی ئیسلام بە شێوەیەکی سەرەکی کێن؟

**(14) شێوازی دەربڕینی دژایەتی بۆ بێباوەڕان لە مێژووی ئیسلامییدا**

**(15) دەربڕینی دژایەتی بەرامبەر بێباوەڕانی لە قۆناغی مەدینەدا**

**(16) پلەو حاڵەتەکانی دۆستایەتی کردنی بێباوەڕان:**

**(17) ئایا تۆبزیکردن لە مسوڵمان بۆ ڕازی کردنی بێباوەڕان لە کوێی دۆستایەتی بۆ بێباوەڕان جێگەی دەبێتەوە؟**

**(18) بۆ نابێ** (ولاء) **مان بۆ کافران هەبێ؟**

**(19) چارەنووس و دواڕۆژی ئەوانەی کە دۆستایەتی بۆ بێباوەڕان دەردەبڕن:**

**(20) پاداشتی ئەوانەی کەوا دۆستایەتییان بۆ خوا دەربڕیوە**

**(21) شێوازەکانی ڕازی بوون بە کوفر**

**(22) حاڵەتی دۆستایەتی و دژایەتی لە سەردەمی زنجیرەی پێغەمبەران و ئیسلامدا**

ئینجا لێرەوە باسەکە دەست پێدەکەین و بە پشتیوانی خوا دانە بە دانە باسیان دەکەین و هەڵوەستەیان لەسەر دەکەین..

## دۆستایەتی و دژایەتی (الولاء والبراء) لە ئیسلامدا

**دۆستایەتی و دژایەتی لە قوڕئان و سوننەتدا:**

خوای پەروەردگار لە قورئاندا دەفەرموێت:

1. ﴿يَاأَيُّهَا الَّذِينَ آمَنوا إِنْ تُطِيعُوا الَّذِينَ كَفَرُوا يَرُدُّوكُمْ عَلَىَ أَعْقَابِكُمْ فَتَنْقَلِبُوا خَاسِرِينَ﴾ (آل عمران: 149). واتە: ئەی بڕواداران ئەگەر ئێوە بەگوێی بێبڕواکان بکەن، ئەوا پاشگەز دەبنەوە لەو پەیمانەی کە لەگەڵ خواتان بەستووە (واتە: لە ئیسلام دەشۆرێن) و دووچاری خەسارەتێکی زۆر دەبن.

2. ﴿وَلاَتَرْكَنُوا إِلىَ الَّذِينَ ظَلَمُوا فَتَمَسَّكُمُ النَّارُ﴾ (هود: 113). واتە: بە ئاستەمیش مەیل مەکەن بەلای ئەوانەی کە زوڵمیان کردووە ئەنا دووچاری ئاگری دۆزەخ دەبن.

3. ﴿مَاكَانَ لِلنَّبِيِّ والَّذِينَ آمَنُوا أَنْ يَسْتَغْفِرُوا لِلْمُشْرِكِيَن ولَوْ كَانُوا أُوْلِي قُرْبَىَ﴾ (التوبة: 113). واتە: بۆ پێغەمبەری خوا و بڕواداران نەهاتووە کە داوای لێبوردن بۆ هاوتاپەرستان بکەن، ئەگەر چی خزم و تیرەشیان بن.

4. ﴿لاَ تَجِدُوا قَوْماً يُؤْمِنُونَ بِاللهِ والْيَوْمِ الآخِرِ يُوَادُّونَ مَنْ حَادَّاللهَ ورَسُولَهُ ولَوْ كَانُوا ابَاءَهُمْ أَوْ أَبْنَاءَهُمْ أَوْ إِخْوَانَهُمْ أَوْعَشِيَرتَهُمْ﴾ (المجادلة: 22) واتە: تۆ بڕواداریێکت چنگ ناکەوێ کە بڕوایان بە خوا و بە ڕۆژی دوایی هەبێ دۆستایەتی بکەن لەگەڵ ئەوانەی کە دژایەتی خوا و پێغەمبەریان کردووە، ئەگەر چی باوکەکانیان یان کوڕەکانیان یان براکانیان یان عەشیرەتەکەیان بن.

5. ﴿إِنَّ الَّذِينَ تَوَفَّاهُمُ الْمَلاَئِكَةُ ظَالِمِي أَنْفُسِهِمْ قَالُوا فِيمَ كُنْتُمْ قَالُوا كُنَّا مُسْتَضْعَفِينَ فِي الأَرْضِ قَالُوا أَلَمْ تَكُنْ أَرْضُ اللهِ واسِعَةً

فَتُهَاجِرُوا فِيهَا فَأُولَئِكَ مَأْوَاهُمْ جَهَنَّمُ وَسَاءَتْ مَصِيراً﴾ (النساء: 97). واتە: بێگومان ئەوانەی کە فریشتەکان گیانیان کێشاون لە حاڵێکدا کە ستەمیان لە خۆیان کردبوو – بە هۆی کۆچ نەکردنەوە – پێیان گوتن: لە چی وەزعێکدا بوون؟ گوتیان چەوسێنراوە بووین لە زەویدا و توانای ڕاکردنمان نەبوو. فریشتەکان گوتیان: ئەدی زەوی خوا فراوان نەبوو کە کۆچتان تێدا کردبا؟ جا ئەوانە شوێنیان دۆزەخە و خراپ ترین سەرەنجامیش ئەوێیە.

6. ﴿وَلَنْ تَرْضَى عَنْكَ الْيَهُودُ وَلاَالنَّصَارَى حَتَّى تَتَّبِعَ مِلَّتَهُمْ﴾ (البقرة: 120). واتە: جولەکە و دیانەکان لێت ڕازی نابن تاوەکو دوای بەرنامەی ئەوان نەکەویت.

7. ﴿وَمَنْ يَتَوَلَّهُمْ مِنْكُمْ فَأُولَئِكَ هُمُ الظَّالِمُونَ﴾ (التوبة: 23). واتە: هەرکەسێك لە ئێوە دۆستایەتییان لەگەڵدا بکات ئەوا دەکەونە ڕیزی زۆردارانەوە.

هەروەها پێغەمبەری خوا "صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وسَلَّم" دەفەرموێت:

1. «مَنْ تَشَبَّهَ بِقَوْمٍ فَهُوَ مِنْهُمْ» (وأبوداود عن عبدالله بن عمر رضي الله عنه/4031) واتە: هەرکەسێك بچێتە سەر شێوەی کۆمەڵێك ئەوە لەوانە.

2. «مَنْ كَثَّرَ سَوَادَ قَوْمٍ فَهُوَ مِنْهُمْ» (رواه أبو يعلى والديلمي عن عبدالله بن مسعود- فتح الباري رقم/ 13/41). واتە: هەرکەسێك ژمارەی کۆمەڵێك زۆر بکات ئەوە لەوانە.

3. «سَيَكُونُ بَعْدِي أُمَرَاءُ يَكْذِبُونَ وَيَظْلِمُونَ فَمَنْ صَدَّقَهُمْ بِكَذِبِهِمْ وَمَنْ أَعَانَهُمْ عَلَى ظُلْمِهِمْ فَلَيْسَ مِنِّي وَلَسْتُ مِنْهُ وَلاَ يَرِدُ عَلَى الْحَوْضِ» (رواه النسائي والترمذي وخرجه الألباني بإسناد جيد/ تخريج كتاب السنة برقم: 759). واتە: لە داهاتوودا چەند کاربە دەستێکی درۆزن و ستەمکار دێنە سەرکار، جا هەرکەسێك شایەدی بۆ درۆیەکانیان بدا و ئۆباڵیان بۆ

بكێشێ‌و، لەسەر ستەم و زۆریان یاریدەیان بدات، نە لە منەو نە من لەویم نە دەشچێتە سەر ئاوی كەوسەر!.

## دەروزازەی یەكەم: سەبارەت بە دۆستایەتی (الولاء)

**یەكەم: بنجوبنەڕەتی (الولاء)**

(الولاء) یان (الوَلاية) لە زمانی عەرەبی بە مانای سەرخستن هاتووە، بۆ نموونە كە دەڵێن: (هم علی ولاية) واتە: بۆ سەرخستن كۆبووەتەوە.

هەروەها وەلی و مەولا لە زمانی عەرەبی هەر یەك شتن، كە دەشڵێن: فولان كەس مەولای تۆیە؛ واتە: شتێك لە نێوان تۆو ئەو كەسە هەیە كە ببێتە هۆی خۆشویستنی تۆ بۆ ئەو، یا كە دەڵێن: خوا وەلی بڕوادارنە؛ واتە: خوا بڕوادارانی خۆش دەوێ سەریان دەخاو پشتگیریان لێ دەكات. خوای گەورەش دەفەرموێت: ﴿اللَّهُ وَلِيُّ الَّذِينَ آمَنُوا يُخْرِجُهُمْ مِنَ الظُّلُمَاتِ إِلَى النُّورِ﴾ (البقرة: 257). واتە: خوادۆست و كارسازی ئەوانەیە كە بڕوادارن دەریان دەهێنێت لە تاریكستانی بێ بڕوایی بۆ ڕووناكی باوەڕو ڕێنموونیی. یان دەفەرموێت: ﴿ذَلِكَ بِأَنَّ اللَّهَ مَوْلَى الَّذِينَ آمَنُوا وَأَنَّ الْكَافِرِينَ لا مَوْلَى لَهُمْ﴾ (محمد:11). واتە: چونكە بێگومان خوا پشتیوانی ئەوانەیە كە باوەڕیان هێناوە بێگومان كافرانیش هیچ پشتیوانێكیان نییە.

كاتێ كە دەڵێن: فولان كەس وەلی ئافرەتەكەیە، واتە بەسەر كاروبارەكانییەوە ڕادەگات و هەڵسوكەوتی لەگەڵیدا وەك باوك یان برایەكی گەورەی لەگەڵدا دەكات.

**لە ڕووی شەرعیشەوە:**

ئەو مانا زاراوەییانەی كە باسمان كرد بە ئیستیسنای هەندێ شت، هەر هەمووی سەبارەت بە هەقی مسوڵمان لە سەر مسوڵمان لە شەریعەتی خوادا جێگیرە.

لەوانەی كە ئیستیسنان و ئەو مانایەی كە باسمان كرد بە تەنها بڕوادار ناگرێتەوە، ئەویش لە بارەی میراتە، وەك خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَأُولُو الْأَرْحَامِ بَعْضُهُمْ أَوْلَى بِبَعْضٍ فِي كِتَابِ اللَّهِ مِنَ الْمُؤْمِنِينَ وَالْمُهَاجِرِينَ﴾ (الأحزاب:

6). واتە: خزمانیش هەندێکیان لەهەندێکی تریان لەپێشترن، لەقورئانی خوادا، لەئیماندااران و کۆچبەران، چونکە ویلایەتی میرات لە سەرەتادا لە سەردەمی پێغەمبەردا "صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وسَلَّم" بۆ کاتێکی دیارکراو شتێکی سابت بوو، بەڵام لە دواییا نەسخ بووەوە.

بۆیە دەتوانین بڵێین کە ئەو ویلایەتەی جێگیرەو بەردەوام دەوری ڕاستەقینە دەبینێت؛ بریتییە لە بەجێگەیاندنی ئەو هەقانەی کە مسوڵمانان لە ناو یەکترا هەیانە، کە بریتییە لە خۆشویستن و سەرخستن و سۆزو بەزەیی بۆ یەکترنواندن و چاودەدێری و هاوبەرپرسیاربوون لە بەرامبەر یەکتردا، هەروەها بریتییە لە لادان و هەڵگرتنی ستەم و ئازارەکان لە سەر مسوڵمانان و دڵدانەوەو پشتگیری کردنیان.

**دووەم: بەڵگەکانی واجببوونی دۆستایەتی مسوڵمان بۆ مسوڵمانان:**

هەڵبەت نموونەو بەڵگەی زۆر ئاشکرامان سەبارەت بە واجببوونی وەلا و دۆستایەتی بۆ مسوڵمانان لە قورئانی پیرۆزدا لە بەردەستە، لەوانە، خوای گەورە دەفەرموێت:

**(1) ﴿إِنَّمَا الْمُؤْمِنُونَ إِخْوَةٌ﴾ (الحجرات: 10). واتە: بێگومان هەر براوادارن بران.**

**(2) ﴿إِنَّ الَّذِينَ آمَنُوا وَهَاجَرُوا وَجَاهَدُوا بِأَمْوَالِهِمْ وَأَنْفُسِهِمْ فِي سَبِيلِ اللَّهِ وَالَّذِينَ آوَوْا وَنَصَرُوا أُولَئِكَ بَعْضُهُمْ أَوْلِيَاءُ بَعْضٍ﴾ (الأنفال: 72). واتە: بەڕاستی ئەوانەی بڕوایان هێنا و کۆچیان کرد و تێکۆشان بەماڵیان و بە گیانیان لە ڕێگای خوادا وە ئەوانەی(کۆچەرەکانیان) گرتە خۆیان و کۆمەکیان کردن ئەوانە پشتیوان و دۆستی یەکترین.**

**(3) ﴿وَالَّذِينَ آمَنُوا مِنْ بَعْدُ وَهَاجَرُوا وَجَاهَدُوا مَعَكُمْ فَأُولَئِكَ مِنْكُمْ﴾ (الأنفال: 75). واتە: وە ئەوانەی لە دواییدا بڕوایان هێناو کۆچیان کرد و لەگەڵ ئێوەدا تێکۆشان، ئا ئەوانە لە ئێوەن. ئەمەش ئەوە دەگەیەنێ کە ئەوانەی لە دواییا باوەڕیان هێناو هیجرەتیان کرد لەگەڵ ئەوانەی پێشوو هیچ تەوفیرێکیان نەبوو، بەڵکوو هەموو وەك جەستە وابوو بۆ یەکتر.**

(4) ﴿وَالَّذِينَ جَاءُوا مِنْ بَعْدِهِمْ يَقُولُونَ رَبَّنَا اغْفِرْ لَنَا وَلِإِخْوَانِنَا الَّذِينَ سَبَقُونَا بِالْإِيمَانِ وَلَا تَجْعَلْ فِي قُلُوبِنَا غِلًّا لِلَّذِينَ آمَنُوا رَبَّنَا إِنَّكَ رَءُوفٌ رَحِيمٌ﴾ (الحشر:10). واتە: ئەوانەش لەپاش ئەمانەوە هاتوون ئەڵێن: ئەی پەروەردگارمان خۆش ببە لە ئێمە وە لەو برایانەشمان (خۆشببە) کە پێشمان کەوتوون لە ئیمان هێناندا وە هیچ ڕق و کینەیەك مەخەرە دڵمانەوە دەربارەی باوەڕداران، ئەی پەروەردگارمان بەڕاستی هەرتۆی دڵسۆزی میهرەبانی.

خوای گەورە وەسفیان دەکات بەوە کە بەردەوام دوعای خێر بۆ یەکتر دەکەن و لە خوا دەپاڕێنەوە کە هیچ ڕق و کینەیەك لە دڵیاندا نەبێت بەرامبەر بە براکانیان.

(5) ﴿وَالْمُؤْمِنُونَ وَالْمُؤْمِنَاتُ بَعْضُهُمْ أَوْلِيَاءُ بَعْضٍ يَأْمُرُونَ بِالْمَعْرُوفِ وَيَنْهَوْنَ عَنِ الْمُنْكَرِ وَيُقِيمُونَ الصَّلَاةَ وَيُؤْتُونَ الزَّكَاةَ وَيُطِيعُونَ اللَّهَ وَرَسُولَهُ أُولَئِكَ سَيَرْحَمُهُمُ اللَّهُ إِنَّ اللَّهَ عَزِيزٌ حَكِيمٌ﴾ (التوبة:71). واتە: پیاوان و ئافرەتانی باوەڕدار هەندێکیان یارمەتی دەر و خۆشەویستی هەندێکی تریانن فەرمان دەدەن بە چاکە و جڵەو گیری دەکەن لە خراپە و بەرێك و پێکی نوێژ جێ بەجێ دەکەن و زەکات(ی سامانیان) دەدەن وە گوێڕایەڵی خواو پێغەمبەرەکەی دەکەن، ئەوانە لە داهاتوودا خوا ڕەحمیان پێ دەکات، بەڕاستی خوا بە دەسەڵاتی کاردروستە.

هەروەها ئەگەر چاوێك بە فەرموودە پیرۆزەکانی پێغەمبەریشماندا بگێڕین، ئەوە فەرموودەگەلێکی زۆر دەبینین لە سەر هاوپەیوەستبوون و دەستبارو یەکتر سەرخستنی بڕوادران، لەوانە دەفەرموێت:

1. «الْمُسْلِمُ أَخُو الْمُسْلِمِ ، لا يَظْلِمُه ، ولا يُسْلِمهُ ، منْ كَانَ فِي حَاجَةِ أَخِيهِ كَانَ اللَّهُ فِي حاجتِهِ ، ومَنْ فَرَّج عنْ مُسْلِمٍ كُرْبَةً فَرَّجَ اللَّهُ عنْهُ بِهَا كُرْبَةً مِنْ كُرَبِ يوْمَ الْقِيامَةِ ، ومَنْ ستر مُسْلِماً سَتَرهُ اللَّهُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ» (الشيخان وأبو داود والترمذي وعن ابن عمر رضي اللَّه عنهما). واتە: مسوڵمان برای مسوڵمانە، زوڵمی لێ ناکات، جێی ناهێڵێ بۆ کەسێك تا ئازاری بدات، کەسێك لە کۆمەك و یارمەتی براکەیدا بێت، خوداش کۆمەك و یارمەتی ئەدات، وە کەسێك نارەحەتییەك لەسەر براکەی لابەرێت، خوداش دەفریای دەکەوێ و نارەحەتییەکانی لە ڕۆژی پەسڵاندا لە سەر لادەبات، وە کەسێك ئابڕووی مسوڵمانێك بپۆشێت، خوداش ئابڕووی ئەو کەسە لە ڕۆژی دوایی دا ئەپۆشێت.

2. «الْمُؤْمِنُ لِلْمُؤْمِن كَالْبُنْيَانِ يَشُدُّ بعْضُهُ بَعْضاً، وَشَبَّكَ بَيْنَ أَصَابِعِه» (رواه مسلم وعن أَبي موسى رضي اللَّه عنه). واتە: بڕوادار بۆ بڕوادار وەك دیوارێ وایە کە هەندێك هەندێکیان پتەووڕاگیر بکات، جا لەو کاتە (پێغەمبەر "صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ

وَعَلَى آلِهِ وسَلَّم") پەنجەکانی دەستی لێك ئالاندن.

3. «مثَلُ الْمُؤْمِنِينَ فِي تَوَادِّهِمْ وتَرَاحُمِهِمْ وتَعاطُفِهِمْ، مَثَلُ الْجَسَدِ إِذَا اشْتَكَى مِنْهُ عُضْوٌ تَداعَى لهُ سائِرُ الْجسدِ بالسهَرِ والْحُمَّى» (متفق عليه وعن النُّعْمَانِ بنِ بشِيرٍ رضي اللَّه عنهما). واتە: وێنەی بڕواداران لە خۆشەویستی و بەزەیی سۆزیانەوە، وەك یەك لاشە وان کاتێ کە ئەندامێکیان بە ناڵەکەوێت ئەوە تێکڕای لاشەکە لە شەونخوونی و ژان و ئازاریاندا دەکەونە خرۆش.

4. «الْمُسْلِمُونَ كَرَجُلٍ وَاحِدٍ اِنِ اشْتَكَى عَيْنُهُ اشْتَكَى كُلُّهُ وَاِنِ اشْتَكَى رَأْسُهُ اشْتَكَى كُلُّهُ» (مسلم والترمذي وأحمد عَنِ النُّعْمَانِ بْنِ بَشِيرٍ رضي اللَّه عنهما). واتە: مسوڵمانان وەك دانە کەسێك وان، ئەگەر ئەو کەسە چاوێکی وە ژان کەوێت ئەوە هەموو لاشەی دەگەڵی وە ژان دەکەون، ئەگەر سەری کەوتە ژان ئەوە هەموو لەشی دەکەوێتە ژان.

**ئەم فەرموودانەی سەرەوە چەن شتێکی گرنگمان لە برایەتی ئیسلامیی پێ نیشان دەدەن، لەوانە:**

**یەکەم**: ئەو هەق و پێویستیانەی کە مسوڵمان لە سەر برای مسوڵمانی خۆی هەیەتی لەوانە:

(1) **خۆشویستن**: ئەمەش لەو فەرموودەدا باش بەرجەستە دەبێ کە دەفەرموێت: «لا يُؤْمِنُ أَحدُكُمْ حتَّى يُحِبَّ لأَخِيهِ مَا يُحِبُّ لِنَفْسِهِ» (متفقٌ عليه عن أَنسٍ رضي اللَّه عنه). واتە: باوەڕی نییە یەکێك تا ئەوەی بۆ خۆی پێی خۆشە بۆ براکەیشی پێی خۆش نەبێت. هەڵبەت ئەمەش بچووکترین هەقی برایەتیی ئیسلامییە! ئەم خەسڵەت و سیفەتەش لە هیچ کەسێکدا مسۆگەر نابێت ئەگەر گیانی خۆشەویستی و برایەتی ڕاستەقینەی لەدڵدا جێگیر نەبووبێت. یان دەبینین پێغەمبەری خوا "صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وسَلَّم" ئاماژە بەوکەسانە دەدات کە لە گۆڕەپانی مەحشەر دەکەونە ژێر سێبەری خوا کە لەو ڕۆژە لەم سێبەرە زێتر سێبەری تر نین، یەکێ لەو جۆرە کەسانە «ورَجُلان تَحَابَّا فِي اللَّهِ اجْتَمَعَا عَلَيْهِ ، وَتَفَرَّقَا عَلَيْهِ». (متفقٌ عليه عن أبي هريرة رضي اللَّه عنه) واتە: وە دوو پیاو کە لەبەر خاتری خوا یەکتریان خۆش بوێ و لە پێناو ئەو کۆ ببنەوە و لە پێناو ئەویش لێك جیا ببنەوە. یان پێغەمبەری خوا "صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وسَلَّم" دەفەرموێت: «ثَلاثٌ مَنْ كُنَّ فِيهِ وَجَدَ بِهِنَّ حَلاَوَةَ الإِيمَانِ : أَنْ يَكُونَ اللَّهُ وَرَسُولُهُ أَحَبَّ إِلَيْهِ مِمَّا ، سِواهُما ، وأَنْ يُحِبَّ المَرْءَ لا يُحِبُّهُ إِلاَّ للَّهِ ، وَأَنْ يكْرَه أَنْ يَعُودَ فِي الكُفْرِ بَعْدَ أَنْ أَنْقذَهُ اللَّهُ مِنْهُ، كَما يكْرَهُ أَنْ يُقْذَفَ فِي

النَّارِ» (متفقٌ عليه متفقٌ عليه عن أَنسٍ رضي اللَّه عنه). **واتە: سێ خەسڵەت هەن لە هەر کەسێکدا مسۆگەر بێت چێژ لە ئیمانی خۆی وەردەگرێت، (کە بریتین لە:) خواو پێغەمبەری خوای لە هەموو شت خۆشتر بوێت، وە کەسێکی تەنها لە بەر خوا خۆشبوێت، وە پێی ناخۆش بێت بگەڕێتەوە نێو کوفرو بێباوەڕ بێتەوە، بەو چەشنەی کە پێی ناخۆشە بهاوێژرێتە نێو ئاگرەوە. یان دەفەرموێت:** «وَالَّذِي نَفْسِي بِيَدِهِ لا تَدْخُلُوا الجَنَّةَ حَتَّى تُؤْمِنُوا ، ولا تُؤْمِنُوا حَتَّى تَحَابُّوا ، أَوَلا أَدُلُّكُمْ عَلَى شَيْءٍ إِذَا فَعَلْتُمُوه تَحَابَبْتُمْ ؟ أَفْشُوا السَّلَامَ بينَكم» (مسلم وأبو داود والترمذي وابن ماجة عن ابي هريرة رضي الله عنه). **واتە: سوێند بەو کەسەی کە گیانی منی بەدەستە، ناچنە بەهەشت تا باوەڕ نەهێنن، باوەڕیش ناهێنن تا یەکترتان خۆش نەوێت، دەسا کارێکتان پێنیشان بدەم کە بەکردنی یەکترتان خۆش بوێت؟ سەلام لە نێو خۆتاندا تەشەنە پێ بدەن. (واتە: سەلام لە یەکتر بکەن). لێرەوە ئەوە فێر دەبین کەوا ئیمان پێش خۆشویستن دروست نابێت، هۆکاری درووست بوونی برایەتی ئیسلامیش سەلام لە یەکتر کردنە.**

**(2) هاوپەیوەستبوون: کە ئەمەشیان وەك زانایان باسی لێوە دەکەن پێنجەم هەقی برایەتی ئیسلامییە، هەروەك پێغەمبەری نازادار** "صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وسَلَّم" **دەفەرموێت:** «حَقُّ الْمُسلِمِ عَلَى الْمُسلِمِ خَمْسٌ، رَدُّ السَّلام. وَعِيادَةُ المَرِيض، وَاتباعُ الجنائز، وإجابة الدَّعوة، وتشميت العاطس» (متفق عليه عن أبي هريرة رضي الله عنه). **واتە: هەقی مسوڵمان لەسەر مسوڵمان پێنج شتە، وەڵامدانەوەی سەلام، سەردانی نەخۆش، شوێنکەوتنی تەرم، بە پیر بانگەوەچوون و دوعای خێر بۆ یەکترکردن لە کاتی پشمیندا. سەبارەت بە** (إجابة الدَّعوة) **بریتییە لەوە کە بە پیر داخوازییەوە بچیت کاتێ کە بۆ داوەت بانگهێشت دەکرێیت، بۆیە پێغەمبەری خوا** "صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وسَلَّم" **دەفەرموێت:** «وَمَنْ لَمْ يَجِبْ الدَّاعِي فَقَدْ عَصَا أبا الْقَاسِم» (رواه مسلم وأبو داود وابن ماجة). **واتە: ئەوەی بە پیر بانگهێشتەوە نەیەت ئەوە یاخی بووە لە باوکی قاسم (پێغەمبەر** "صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وسَلَّم" **). یان وەك لە سەحیحی بوخاریدا دەفەرموێت:** «وَلَوْ دُعِيت إِلَى كُرَاعٍ لأَجَبْتُ». **واتە: ئەگەر بۆ کوڕاع (شوێنێکە لە نێوان مەککەو مەدینە) بانگهێشتم بکەن؛ دەچم.**

**(3) نوسرەت و سەرخستنی: واتە ئەبێ مسوڵمان هەمیشە لە پشت برا مسوڵمانەکەی خۆیەوە بێت و بەری نەدات،**

کاتێ کە یەکێك لە براکانی تووشی نەهامەتی و چۆرتمێك بووە، ئەوە پێویستە لە هەلی هیچ دەرفەتێك نەسڵەمێتەوە بۆ سەرخستن و پشتگیری کردنی، بۆیە خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَمَا لَكُمْ لا تُقَاتِلُونَ فِي سَبِيلِ اللَّهِ وَالْمُسْتَضْعَفِينَ مِنَ الرِّجَالِ وَالنِّسَاءِ وَالْوِلْدَانِ الَّذِينَ يَقُولُونَ رَبَّنَا أَخْرِجْنَا مِنْ هَذِهِ الْقَرْيَةِ الظَّالِمِ أَهْلُهَا وَاجْعَلْ لَنَا مِنْ لَدُنْكَ وَلِيّاً وَاجْعَلْ لَنَا مِنْ لَدُنْكَ نَصِيراً﴾ (النساء: 75). واتە: ئەوە چیتانە (بەچ بیانوویەك) جەنگ ناکەن لە پێناوی خوادا و لە پێناوی چەوساوەکان لە پیاوان و ئافرەتان و منداڵان، ئەوانەی کە دەڵێن ئەی پەروەردگارمان ڕزگارمان کەی لەم شارە کە خەڵکەکەی ستەمکارن وە لەلایەن خۆتەوە دڵسۆزێکمان بۆ بەدی بهێنە وە لەلایەن خۆتەوە بەدی بهێنە بۆمان یارمەتی دەرێك.

دەبینین کە خوای گەورە لێرە شەڕو غەزای فەرزکردووە بۆ سەرخستن و پشتگیری کردنی مسوڵمانان.. بۆیە پێغەمبەری خوا "صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وسَلَّم" دەفەرموێت: «انْصُرْ أَخَاكَ ظَالِماً أَوْ مَظْلُوماً» فقَالَ رَجُلٌ: يَا رسول اللَّه أَنْصرهُ إِذَا كَانَ مَظلُوماً أَرَأَيْتَ إِنْ كَانَ ظَالِماً كَيْفَ أَنْصُرُهُ ؟ قال: تَحْجُزُهُ أَوْ تَمْنَعُهُ مِنَ الظُّلْمِ فَإِنَّ ذلِك نَصْرُهْ» (رواه البخاري .عن انس رضي الله عنه). واتە: براکەت سەرخە ئەگەر زۆرداربوو، یا زۆرلێکراو بوو. پیاوێك گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا سەری دەخەم ئەگەر ستەملێکراو بوو، ئەی ئەگەر ستەمکاربوو چۆن سەری بخەم؟ فەرمووی: بەرهەڵستی بکەو ڕێی لێبگرە کە چیتر زوڵمێ نەکات، ئا بەم چەشنە تۆ ئەوت سەرخستووە. پێغەمبەری نازدار "صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وسَلَّم" لەم فەرموودە ئاماژە بەوەدەدات کە لە هەرکێ مسوڵمان زوڵمی لێ ئەکرا، ئەبێ تۆ بچیت یارمەتی بدەیت و زوڵمەکەی لەسەر هەڵبگریت.. وە دەستی زاڵمیش بگریت کە چیتر زوڵمێ نەکات! یان پێغەمبەر "صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وسَلَّم" دەفەرموێت: «الْمُسْلِمُ أَخُو الْمُسْلِمِ ، لا يظْلِمُه ، ولا يُسْلِمهُ» (البخاري ومسلم والترمذي وغيرهم). (پێشتر ماناکراوە). مانای (لاَ يُسْلِمهُ) واتە: بۆ دوژمنانی لێ ناگەڕێت کە بە دڵی خۆیان زوڵم لە بڕوادران بکەن. بۆیە دەبێ بزانین کە نوسرەت و سەرخستنی مسوڵمانان بنچینەو بنەڕەتێکی زۆر بەهێزی ئەم دینەیە، بەڵکوو لە ئیسلامدا ئەحکامی تایبەتی خۆی بۆ دیارکراوە، بۆیە پێویستە هەتا لە کاتی بێ دەسەڵاتیشا ئەگەر هیچمان پێ نەکرێت بۆ سەرخستنی مسوڵمانان ئەبێ دوعای خێریان بۆ بکەین و لە خوا بخوازین کە لە نەهامەتی و ناڕەحەتییەکاندا ڕزگاری بکات، ئەوەتا دەبینین کاتێ کە پێغەبەری خوا "صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وسَلَّم" بە لای خاووخێزانی یاسردا ڕەت دەبوو، دەیبینی کە چ ئەشکەنجە ئازارێکیان لە سەرە، بەلایاندا دەهات دڵیانی

ئەدایەوەو دەیفەرموو: «صَبْراً آلَ يَاسر فَإِنَّ مَوْعِدَكُمُ الْجَنَّة» (سيرة ابن هشام 1/319-320). واتە: ئارامگربن ئەی خانەوادەی یاسر؛ چون ژوانی بەهەشتتان پێ دراوە. ئەو کاتە پێغەمبەری خوا لە دوعا زیاتر چیتری لە دەست نەدەهات کە بۆ ئەو خێزانە ئیماندار بیکات و لە ژێر دەستی ئەبووجەهلی زۆردارو دڵ ڕەق دەریانبیهێنێ و ڕزگاریان بکات. بەڵام کاتێ کە دەستی بوو.. هێزو دەسڵاتی پەیا کرد ئەوە بۆ سەرخستنی مسوڵمان لە هەرکێیەکا بووبێت درێخی نەدەکرد ودوودڵی لێ نەدەکرد، بۆیە لەم سات و هێزەی مسوڵمانان بوو خوای گەورە تەکلیفی لێ دەکردن و دەیفەرموو: ﴿وَإِنِ اسْتَنْصَرُوكُمْ فِي الدِّينِ فَعَلَيْكُمُ النَّصْرُ إِلَّا عَلَى قَوْمٍ بَيْنَكُمْ وَبَيْنَهُمْ مِيثَاقٌ وَاللَّهُ بِمَا تَعْمَلُونَ بَصِيرٌ﴾ (الأنفال: 72). واتە: وە ئەگەر داوای یارمەتیان لێ کردن لە (پارێزگاری) ئایین ئەوە پێویستە لەسەرتان یارمەتی دانیان مەگەر لە دژی گەلێك لە نێوان ئێوە و ئەوان دا پەیمان هەبووبێت (ئەو دەمە نابێت یارمەتیان بدەن) وە خوا بینایە بەوەی کە دەیکەن. یان دەیفەرموو: ﴿وَمَا لَكُمْ لا تُقَاتِلُونَ فِي سَبِيلِ اللَّهِ وَالْمُسْتَضْعَفِينَ مِنَ الرِّجَالِ وَالنِّسَاءِ وَالْوِلْدَانِ﴾ (النساء: 75). (پێشتر ڕاڤەکراوە)

**دووەم: هەقە تایبەتییەکان:**

هەڵبەت هەندێ هەق هەن تایبەتن، پێویستە ئەوەمان لەر بەرچاوبێت و لە گەڵ شتی تەوفیریان کەین، لەوانە:

(1) هەقی پێغەمبەر "صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وسَلَّم":

ئەو پێغەمبەرە مەزنە کە پێشەواو پێشەنگی مرۆڤایەتی و سەرداری ئەم ئوممەتەیە "صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وسَلَّم" لە سەر خستن و خۆشەویستی ئەم زاتە پاکە ئەبێ مسوڵمانان لە بەرامبەر هەر حەزێکی دەروونی و هەر پیلان و نەخشەیەکی شەیتانی، یا هەر سووکایەتی و بێرێزییەکی لای دوژمنانی لە خەمی دابێ و سەریخات.. هەر ئەمەشە بنەڕەت و بنجوبنەوانی ئەم دینە، بۆیە تا ئێستا هیچ کەس شایەتی لێ وەرنەگیراوە بە بێ شایەتی دان بە پێغەمبەرایەتی و سەرمەشقی ئەم زاتە بەرزەی ئیسلام. خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿إِنَّا أَرْسَلْنَاكَ شَاهِداً وَمُبَشِّراً وَنَذِيراً * لِتُؤْمِنُوا بِاللَّهِ وَرَسُولِهِ وَتُعَزِّرُوهُ وَتُوَقِّرُوهُ وَتُسَبِّحُوهُ بُكْرَةً وَأَصِيلاً﴾ (الفتح:8-9). واتە: بەڕاستی (ئەی موحەممەد "صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وسَلَّم") تۆمان ناردووە بەشایەت و مژدەدەرو ترسێنەر، بۆ ئەوەی باوەڕ بەخواو پێغەمبەرەکەی بێنن وە پشتیوانی لێ بکەن و ڕێزی لێ بگرن وە تەسبێحاتی خوا بکەن لە بەیانیان و ئێواراندا.

دەبینین کەوا هەقەکانی پێغەمبەرو خۆشویستنی ئەم سەرداره نازداره لە یەك ئایەتدا کۆ بووەتەوە، بۆیە ئەوانەی کە ئەزیەتیشی دەدەن شایەنی نەفرەت و دژایەتی کردنن، هەروەك تێکڕای زانایان یەکدەنگن لە سەر ئەوە کە هەر کەس جنێو بە پێغەمبەر بدات و سووکایەتی پێ بکات کافر دەبێ موستەهەقی کوشتنە. بۆیە خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿إِنَّ الَّذِينَ يُؤْذُونَ اللَّهَ وَرَسُولَهُ لَعَنَهُمُ اللَّهُ فِي الدُّنْيَا وَالْآخِرَةِ وَأَعَدَّ لَهُمْ عَذَاباً مُهِيناً﴾ (الأحزاب:57). واتە: بەڕاستی کەسانێ کە ئازاری خواو پێغەمبەرەکەی دەدەن خوا نەفرینی لێ کردوون لە دنیاو لە ئاخیرەتدا، وە سزای ڕیسواکەری بۆ ئامادە کردوون. دەبینین کە خوا زاتی پاکی خۆی لەگەڵ زاتی پێغەمبەری نازدار لە یەك ئایەتدا کۆکردۆتەوە، چونکە ئەوەی بێ باوەڕ بێت بەرامبەر بەخوا ئەوە بێ باوەڕیشە بەرامبەر بە پێغەمبەر "صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وسَلَّم" ئەوەی سووکایەتی و کوفر بە خوا بکات ئەوە بە پێغەمبەریشی کردووە.. بۆیە ئەوەی جنێو بە خوا بدات کافر دەبێ و حوکمی کوشتنە، ئەوەی جنێو بە پێغەمبەریش بدات هەمان حوکم دەیگرێتەوە.

بۆیە ئەدەب و نەرمی نواندن لە بەرامبەر پێغەمبەر "صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وسَلَّم" بە واجبێکی حەتمی لە سەر ئوممەتەکەی پێویست کراوە، وەك خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا لا تَرْفَعُوا أَصْوَاتَكُمْ فَوْقَ صَوْتِ النَّبِيِّ وَلا تَجْهَرُوا لَهُ بِالْقَوْلِ كَجَهْرِ بَعْضِكُمْ لِبَعْضٍ أَنْ تَحْبَطَ أَعْمَالُكُمْ وَأَنْتُمْ لا تَشْعُرُونَ﴾ (الحجرات: 2). واتە: ئەی ئەو کەسانەی کە باوەڕتان هێناوە! دەنگتان بەرز مەکەنەوە بەسەر دەنگی پێغەمبەردا "صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وسَلَّم" وە بە دەنگی بەرز قسەی لەگەڵ مەکەن وەك دەنگ بەرزکردنەوەتان لەگەڵ یەکتری، نەوەکو کردەوەکانتان بەتاڵ بێتەوە خۆشتان هەستی پێ نەکەن. لە فەرمایشتی ﴿وَأَنْتُمْ لا تَشْعُرُونَ﴾ بەڵگەیە لە سەر ئەوە کە کەسێك لە دەنگ بەرزکردنەوەی بە بێ مەبەستی سووکایەتی کردن بە پێغەمبەر "صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وسَلَّم" کردەوەکان پووچ دەکەنەوە، بەڵام ئەوەی دەنگی خۆی لەسەر فەرمانی خوا بەرز بکاتەوەو بە نیازی سووکایەتی کردن بە پێغەمبەر "صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وسَلَّم" ئەوە پێی کافر دەبێت و دەکەویتە بەر نەفرەتی خواو پێغەمبەرەوە "صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وسَلَّم".

**(2) هەقی زانایان:**

لە دوای هەقی پێغەمبەر "صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وسَلَّم" هەقی میراتگرانی دێت کە زانایانن، زانایان ئەوانەن کە

میراتی پێغەمبەریان کەوتۆتە دەست و لە خێرو بەرەکەتی ئەم میراتە بە سەر مسوڵمانان دەبخشنەوە، ئەویش زانستی شەرعییە.. ئەوان لە دوای پێغەمبەر "صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وسَلَّم" خاوەن فەزڵ و گەورەیین بەسەر ئوممەتی ئیسلامیدا، بۆیە خۆشەویستی و نوسرەتی ئەم زانایانە واجبە لەسەر هەموو مسوڵمانێك، بەڵكوو ئەبێ پێگەو جێگەیان لە نێو کۆمەڵگەی ئیسلامیدا پارێزراو بێت و لە بەرامبەر پلان و نەخشەی دوژمنانیان سەریان بخەین و بەرگرییان لێ بکەین. بۆیە پێغەمبەری خوا "صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وسَلَّم" دەفەرموێت: «مَنْ صَنَعَ لَكُمْ مَعْرُوفًا فَكَافِئُوهُ، فَإِنْ لَمْ تَجِدُوا مَا تُكَافِئُوهُ فَادْعُوا لَهُ حَتَّى تَظُنُّوا أَنَّكُمْ قَدْ كَافَأْتُمُوهُ» (أبو داود والنسائي وأحمد). واتە: ئەگەر کەسێك چاکەیەکی بۆ کردن، ئێوەش پاداشتی بدەنەوە، خۆ ئەگەر شتێکیشتان شك نەبرد کە چاکەی پێ بدەنەوە، داوەتی بکەن تا ئەو کاتە یەکلادەبنەوە لەوە چاکەکانتان بە تەواوی پێ داونەتەوە یان نا.

هەروەها دەبینین کەوا خوای پەروەردگار لە یەك ئایەتدا نوسرەت و خۆشەویستی خۆی لەگەڵ پێغەمبەر و بڕوادران حسێب کردووە، وەك دەفەرموێت: ﴿إِنَّمَا وَلِيُّكُمُ اللَّهُ وَرَسُولُهُ وَالَّذِينَ آمَنُوا الَّذِينَ يُقِيمُونَ الصَّلاةَ وَيُؤْتُونَ الزَّكَاةَ وَهُمْ رَاكِعُونَ﴾ (المائدة:55). واتە: بێگومان دۆست و یارمەتی دەری ئێوە تەنها خوا و پێغەمبەرەکەیی و بڕواداranن ئەوانەی کە بە ڕێکوپێکی نوێژەکانیان بە جێ دەهێنن و زەکات ئەدەن بەردەوام مل کەچن بۆ فەرمانی خوا.

یان دەفەرموێت: ﴿مُحَمَّدٌ رَسُولُ اللَّهِ وَالَّذِينَ مَعَهُ أَشِدَّاءُ عَلَى الْكُفَّارِ رُحَمَاءُ بَيْنَهُمْ﴾ (الفتح: 29). واتە: موحەممەد "صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وسَلَّم" پێغەمبەری خوایە ئەو (باوەڕدار)انەش کە لەگەڵیدان بەرامبەر بێ باوەڕان توندو تیژن و لە نێوان خۆیاندا بە بەزەیین.

**(3) هەقی دایکوباوك و خزمان:**

جۆرێکی تر لە نواندنی خۆشەویستی و دوعای خێرکردن بریتییە لە دەربڕینی چاکە بەرامبەر بە دایکان و باوکان و **خزمان. دەبینین هەروەك لە هەردوو سەحیحەکەدا هاتووە کە پیاوێك دێتە خزمەت پێغەمبەر "صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وسَلَّم" و دەڵێت: «مَنْ أَحَقُّ النَّاسِ بِحُسْنِ صَحَابَتِي؟» واتە: کێ شیاوترە کە بیکەم بە هاوڕێی خۆم؟ ئەویش دەفەرموێت: «أُمُّك» واتە: دایکت، دەڵێت: پاشان کێ؟ دەفەرموێت: « أُمُّك»، دایکت، ئەڵێت: ئەی پاشتر کێ؟ دەفەرموێت: «أُمُّك»، دایکت، ئەڵێت: ئەی پاشان کێ؟ فەرمووی: «أَبَاك»، واتە: (ئینجا) باوکت! (متفق علیه). وە**

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَقَضَى رَبُّكَ أَلَّا تَعْبُدُوا إِلَّا إِيَّاهُ وَبِالْوَالِدَيْنِ إِحْسَاناً إِمَّا يَبْلُغَنَّ عِنْدَكَ الْكِبَرَ أَحَدُهُمَا أَوْ كِلاهُمَا فَلا تَقُلْ لَهُمَا أُفٍّ وَلا تَنْهَرْهُمَا وَقُلْ لَهُمَا قَوْلاً كَرِيماً * وَاخْفِضْ لَهُمَا جَنَاحَ الذُّلِّ مِنَ الرَّحْمَةِ وَقُلْ رَبِّ ارْحَمْهُمَا كَمَا رَبَّيَانِي صَغِيراً﴾ (الاسراء: 23-24). واتە: وە پەروەردگارت بڕیاری داوە کە هیچ شتێ نەپەرستن بێجگە لە ئەو وە لەگەڵ دایك و باوکتان چاکە بکەن ئەگەر یەکێکیان (باوکت و دایکت) یان هەردووکیان لای تۆ پیربوون قسەی ناخۆشیان پێ مەڵێ تەنانەت ئۆفیش، وە تێیان مەخوڕە و پێیاندا هەڵمەشاخێ (بەڵکوو) قسەی نەرم و شیرینیان (لەگەڵدا) بەکاربێنە، باڵی خۆ بەکەم زانینیان بۆ ڕابخە لەبەر بەزەیی و میهرەبانیت پێیان بڵێ ئەی پەروەردگارم ڕەحمیان پێ بکە هەرچۆنێ ئەوان منیان پەروەردە کرد بە منداڵی. یان لە سووڕەتی لوقماندا دەفەرموێت: ﴿وَوَصَّيْنَا الْإِنْسَانَ بِوَالِدَيْهِ حَمَلَتْهُ أُمُّهُ وَهْناً عَلَى وَهْنٍ وَفِصَالُهُ فِي عَامَيْنِ أَنِ اشْكُرْ لِي وَلِوَالِدَيْكَ إِلَيَّ الْمَصِيرُ * وَإِنْ جَاهَدَاكَ عَلَى أَنْ تُشْرِكَ بِي مَا لَيْسَ لَكَ بِهِ عِلْمٌ فَلا تُطِعْهُمَا وَصَاحِبْهُمَا فِي الدُّنْيَا مَعْرُوفاً وَاتَّبِعْ سَبِيلَ مَنْ أَنَابَ إِلَيَّ ثُمَّ إِلَيَّ مَرْجِعُكُمْ فَأُنَبِّئُكُمْ بِمَا كُنْتُمْ تَعْمَلُونَ﴾ (لقمان: 14- 15). واتە: وە فەرمانمان داوە بە ئادەمی (بە چاکی هەڵس و کەوت کردن لەگەڵ) دایك و باوکیدا، دایکی هەڵی ئەگرێ بە دووگیانی (پێی لاواز دەبێ) لاوازی لە دوای لاوازی و بڕینەوەی لە شیر لە (دوا تەمەنی) دوو ساڵیەوە (وە فەرمانمان بە ئادەمیدا) کە سوپاس گوزاری من (خوا) و باوك و دایکت بکە تەنها بۆ لای منە گەڕانەوەتان. وە ئەگەر (باوك و دایکت) ئەوپەڕی هەوڵیاندا لەگەڵت بۆ ئەوەی شتێ بکەیت بە هاوبەشی من کە هیچ زانیارییەکت پێی نییە، ئەوە گوێڕایەڵییان مەکە بەڵام لە دونیادا زۆر بەچاکی هاوڕێیەتیان بکە و شوێن ڕێگای کەسێك بکەوە کە بە دڵسۆزی گەڕاوەتەوە بۆ لای من (لەدوا ڕۆژدا) گەڕانەوەتان تەنها بۆ لای منە ئینجا هەواڵتان دەدەمێ بەو کردەوانەی کە کردووتانە.

هەروەها لە دوای دایکوباوك ئینجا باس لە خزمان دەکات، کە چاکەکار بیت لە گەڵیان و خۆشیانت بوێن و بە تەنگیانەوە بچیت. وەك خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿فَهَلْ عَسَيْتُمْ إِنْ تَوَلَّيْتُمْ أَنْ تُفْسِدُوا فِي الْأَرْضِ وَتُقَطِّعُوا أَرْحَامَكُمْ * أُولَئِكَ الَّذِينَ لَعَنَهُمُ اللَّهُ فَأَصَمَّهُمْ وَأَعْمَى أَبْصَارَهُمْ﴾ (محمد: 22-23). واتە: جا ئایا ئێوە بەتەمان (ئەی ناپاکان) ئەگەر پشت هەڵکەن (لە ئیسلام و جیهاد) لە زەویدا ئاژاوە و خراپە بەرپا بکەن وە هەرچی پەیوەندی خزمایەتی یە ببپچڕێنن. ئا ئەوانە ئەو کەسانەن کە خوا نەفرینی لێ کردوون وە کەڕی کردوون و چاویانی کوێر کردووە. هەروەها پێغەمبەری خوا "صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وسَلَّم" دەفەرموێت: «لاَ يَدْخُلُ الجَنَّةَ قَاطِعْ» (الشيخان وأبو داود والترمذي

وأحمد). واتە: ناچێتە بەهەشت کەسێك سیلەی ڕەحمی پچڕاندبێت.

یان خوای گەورە لە فەرموودەیەکی قودسیدا دەفەرموێت: «أَنَا الرَّحْمَنْ خَلَقْتُ الرَّحْمَ وَوَضَعْتُ لَهَا إِسْماً مِنْ إِسْمِي فَمَنْ وَصَلَهَا وَصَلْتُهُ وَمَنْ قَطَعَهَا قَطَعْتُهُ» (أحمد وغيره). واتە: من ئەوپەڕی میهرەبانم و بەزەییم درووست کردووە، وە گێڕاومە لە ناوێك لە ناوەکانی خۆم، هەرکەسێك بەجێی بگەیەنێت، منیش لەگەڵی بەجێ دەگەیەنم، ئەوەی بیشیپچڕێنێت، منیش لەگەڵیدا دەیپچڕێنم. بۆیە سیلەی ڕەحم واجبە لەسەر مسوڵمان کە ئەبێ بە جێی بگەیەنێت، هەتا ئەگەر خزمەکانیان کافر و بێ باوەڕیش بن مادام دژایەتییان لەگەڵ دینەکەدا نەبێ و شەڕیان لە گەڵ ئەهلی ئیسلامدا نەبووبێ. (لە دواییا لە باسی بەڕائدا زیاتر قسەی لەسەر دەکەن)، بۆیە خوای گەورە زۆر بە ڕاشکاوانە باس لە واجببوونی چاکە دەکات بەرامبەر بە خزم، ئەوەتا دەفەرموێت: ﴿لَيْسَ عَلَيْكَ هُدَاهُمْ وَلَكِنَّ اللَّهَ يَهْدِي مَنْ يَشَاءُ وَمَا تُنْفِقُوا مِنْ خَيْرٍ فَلِأَنْفُسِكُمْ وَمَا تُنْفِقُونَ إِلَّا ابْتِغَاءَ وَجْهِ اللَّهِ وَمَا تُنْفِقُوا مِنْ خَيْرٍ يُوَفَّ إِلَيْكُمْ وَأَنْتُمْ لا تُظْلَمُونَ﴾ (البقرة:272). واتە: لەسەر تۆ نییە (ئەی موحەممەد "صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وسَلَّم") ڕێنموونیی و مسوڵمان کردنی خەڵکی، بەڵکوو خوا هەرکەسێکی بوێ هیدایەتی دەدات وە ئەوەی بەختی دەکەن لە دارایی(چاکە) ئەوە (قازانجەکەی) بۆ خۆتانە ئێوە هیچ بەخت ناکەن، مەگەر بۆ ڕەزای خوا نەبێ وە ئەوەی(بەختی) دەکەن لەسامان (چاکە) ئەتان درێتەوەو ئێوە ستەمتان لێ ناکرێ.

**(4) هەقی دراوسێیەتی و هاوڕێیەتی و شەڕاکەت و میوادنداریێتی:**

لە دوای هەقەکانی بە جێگەیاندنی سیلەی ڕەحم؛ هەقی دراوسێیەتی و میوانداری دێت، هەموو ئەمانەش دەقی ئاشکرایان لەسەرە لە قوڕئان و سوننەتی پیرۆزدا، هەروەك خوای گەورە دەفەرموێت:﴿وَاعْبُدُوا اللَّهَ وَلا تُشْرِكُوا بِهِ شَيْئاً وَبِالْوَالِدَيْنِ إِحْسَاناً وَبِذِي الْقُرْبَى وَالْيَتَامَى وَالْمَسَاكِينِ وَالْجَارِ ذِي الْقُرْبَى وَالْجَارِ الْجُنُبِ وَالصَّاحِبِ بِالْجَنْبِ وَابْنِ السَّبِيلِ وَمَا مَلَكَتْ أَيْمَانُكُمْ إِنَّ اللَّهَ لا يُحِبُّ مَنْ كَانَ مُخْتَالاً فَخُوراً﴾ (النساء: 36). واتە: بەس خوا بپەرستن، و هیچ شتێك مەکەن بەهاوبەشی، هەروەها لەگەڵ دایك و باوکتاندا چاك بن، وە لەگەڵ خزم و نزیکان و هەتیوان و هەژاران و هاوسێی خزم و هاوسێی بێگانە، یا دوور و هاوڕێی هەمیشەیی، یا هاوڕێی سەفەر و ڕێبوار و ئەوانەی بوون بە موڵکتان(چاك بن لەگەڵیاندا). بەڕاستی خوا خۆشی ناوێت ئەو کەسەی کە خۆ بەزلزان و شانازی کەر بێ. هەروەها

پێغەمبەری خو "صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وسَلَّم" دەفەرموێت: «مَا زَالَ جِبْرِيلُ يُوصِينِي بِالجارِ حتَّى ظَنَنتُ أَنَّهُ سيُوَرِّثُهُ» (متفق عليه عن ابنِ عمرَ وعائشةَ رضي اللّه عنهما). واتە: بەردەوام جوبریل ڕایئەسپاردم کە چاکە لەگەڵ دراوسێدا بکەم تا گومانم برد کە ڕەنگە دراوسێ میرات بگرێت! وە سەبارەت بە میوادارییی ئەوە پێغەمبەری خوا "صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وسَلَّم" فەرموویەتی: «مَنْ كَانَ يُؤمِنُ بِاللّهِ والْيومِ الآخِرِ ، فَلْيُحسِنْ إِلى جارِهِ ...» (رواه مسلم وعن أبي شُرَيْحٍ الخُزاعيِّ رضي اللّه عنه). واتە: کەسێك باوەڕی بە خواو بە ڕۆژی دوایی هەبێت، با لەگەڵ دراوسێکەی چاك بێت.. هەروەها دەفەرموێت: «واللّهِ لا يُؤْمِنُ ، واللّهِ لا يُؤْمِنُ، واللّهِ لا يُؤْمِنُ، قِيلَ : منْ يا رسولَ اللّهِ ؟ قال : الّذي : لا يأْمنُ جارُهُ بَوَائِقَهُ» (البخاري ومسلم وأحمد عن أبي هريرة رضي اللّه عنه). واتە: بەوخوایە باوەڕی نییە، بەوخوایە باوەڕی نییە، گوتیان: کێ ئەی پێغەمبەری خوا "صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وسَلَّم" فەرمووی: ئەو کەسەی کە دراوسێکەی لە شەڕی ئاسوودە نییە.

**(5) هەقی هەژاران و نەداران و ڕێبوران و سواڵکەران:**

لەدوای هەقەکانی سەرەوە هەقی هەژارو نەدارو ڕێبوارن و دەستکورتان دێت، هەڵبەت بۆ ئەمەش دەقگەلێکی زۆر هەیە لە قورئان و سوننەت، وەك خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿إِنَّمَا الصَّدَقَاتُ لِلْفُقَرَاءِ وَالْمَسَاكِينِ وَالْعَامِلِينَ عَلَيْهَا وَالْمُؤَلَّفَةِ قُلُوبُهُمْ وَفِي الرِّقَابِ وَالْغَارِمِينَ وَفِي سَبِيلِ اللَّهِ وَابْنِ السَّبِيلِ فَرِيضَةً مِنَ اللَّهِ وَاللَّهُ عَلِيمٌ حَكِيمٌ﴾ (التوبة: 60). **واتە: بەڕاستی خێرەکان تەنها بۆ بێ نەوایان و هەژاران و کرێکارانێك کە بەسەریەوەن (کۆی دەکەنەوە) وە ئەوانەی دڵیان دائەهێنرێ (بۆخۆش ویستنی ئیسلام) وە بۆ ئازاد کردنی بەندەو کۆیلەکان و بۆ قەرزاران و لە ڕێی (بەهێز کردنی ئایینی) خوادا و بۆ ڕێبواران ئەمە پێویست کراوە لە لایەن خواوە، وە خوا زانای کاردروستە.**

**یان دەفەرموێت:** ﴿وَفِي أَمْوَالِهِمْ حَقٌّ لِلسَّائِلِ وَالْمَحْرُومِ﴾ (الذريات: 19). **واتە: وە لە ماڵ و داراییياندا بۆ (هەژاری) داواکەرو داوانەکەر مافی خۆیان هەبوو.**

**سێیەم: دژەکانی موالات:**

لەم قسانەی پێشەوە بنجوبنەوانی وەلائمان بۆ ئاشکرا بوو، چ لە ڕووی شەرعییەوە چ لە ڕووی زمانەوانییەوە، تێگەیشتین کە وەلاء چییە، بۆیە لێرە پێویستە ئەوە بزانین وەك چۆن دەستنوێژ بە هەندێ شت دەشکێت

وەلائیش بەهەمان شێوە زۆر زوو لە بێ ئاگاییا دەشکێت، لەوانە:

## 1. دەرکردنی مسوڵمان لە ئیسلامەتی بە بێ بە بوونی بەڵگەیەکی ئاشکرا:

هەر کەسێك حوکم لەسەر مسوڵمانێك دەرکات و لە ئیسلامی بباتە دەر، لە کاتێك کە ئەو کەسە خۆشی چاك لە ناخی خۆیدا ئەوە دەزانێت کە ئەو کەسە مسوڵمانە یاخود نا! پێغەمبەری خوا "صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وسَلَّم" دەفەرموێت «أَيُّمَا امْرِئٍ قَالَ لأَخِيهِ يَا كَافِرُ . فَقَدْ بَاءَ بِهَا أَحَدُهُمَا إِنْ كَانَ كَمَا قَالَ وَإِلاَّ رَجَعَتْ عَلَيْهِ» (رواه مسلم عن ابن عمر رضي الله عنهما) واتە: هەر کەسێك بە براکەی بڵێت: ئەی بێباوەڕ، ئەوە یەکێکیان بێباوەڕی لەسەر دەچەسپێت، ئەگەر ئەو کەسە بێباوەڕ بێت (ئەوە بێ باوەڕە) دەنا بێباوەڕییەکە بۆ خۆی دەگەڕێتەوە!! (خوا پەنامان بدات). یاخود دەفەرموێت: «وَمَنْ دَعَا رَجُلاً بِالْكُفْرِ أَوْ قَالَ عَدُوَّ اللَّهِ . وَلَيْسَ كَذَلِكَ إِلاَّ حَارَ عَلَيْهِ» (رواه مسلم عن ابي ذر رضي الله عنه). واتە: ئەگەر یەکێك بانگی یەکێك بکات بە کافر، یان پێی بڵێت: دوژمنی خوا، کەچی نە کافر بێ و نەدوژمنی خواش، ئەوە کوفرو دژایەتییەکەی بۆ خوا بۆ خۆی دەگەڕێتەوە. بۆیە تەکفیرکردنی مسوڵمانێك لە ئیسلامدا زۆر حسێبی دوورو قووڵی بۆ کراوە، هەڵبەت ئەگەر ئەو کەسەیش کە گومانی چووبێتە کوفری کەسێکەوە لە بەرکردنی شتێك کە وا ئاشکرایە بە کردنی ئەو شتە کافر دەبێت، بەڵام پێی کافر نەبووبێت، ئەوە بە تەئکید ئەو کەسە کەوتۆتە تاوانێکی زۆر گەورەوە، بە تایبەت ئەگەر زانرا کە ئەو کەسەی ئەو کارە کوفرەیی ئەنجامداوە کەسێکی نەفامەو لە جەهل و نەفامی خۆیەوە وای زانیبێت کە ئەمە شتێکی چاکەو پێی کافر نابێت. بەڵام خۆ ئەگەر کەسێ کەسێك کافر بکات و بیشزانێت کە ئەو کەسە بەم کارەی کە کردوویەتی پێی کافر نەبووە ئەوە بێگومان ئەو کەسە خۆی دەکەوێتە کوفرەوە خوا پەنامان بدات.

## 2. حەڵاڵ کردنی خوێن و ئابڕوو و ماڵی مسوڵمانێك بە ناهەق:

بێگومان شوێنکەوتنی حوزڕمەت و ئابڕوو و ماڵ و سامانی مسوڵمانێك حەڕامە، هەروەك پێغەمبەری خوا "صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وسَلَّم" لە گوتاری ماڵ ئاواییەکەی خۆیدا فەرمووی: «إنَّ دِماءَكُم، وأَمْوالَكم وأعْراضَكُم حرامٌ عَلَيْكُم كَحُرْمة يومِكُم هذا، في شهرِكُمْ هذا، في بَلَدِكُم هذا، ألا هَلْ بلَّغْت» (متفقٌ عليه عنْ أبي بكْرَةَ رضي اللَّه عنْه). واتە: بزانن خوێنتان، ماڵ و ئابڕووتان لە یەکتر حەڕامە، وەك حەڕامی ئەمڕۆتان، لەو مانگەی ئەمڕۆتان، لەم شارەی خۆتان،

ئایا گەیاندم؟!! بۆیە ئاشکرایە کە بەحەڵاڵ زانینی تاوانێك پێی کافر دەبیت و لە ئیسلام دەردەچیت! بۆیە بێحورمەتیکردنی خوێنی مسوڵمان و شوێنکەوتنی ئابڕوویيان و پێشێل کردنی مافی ڕەوای خۆیان کە خوا حەرامی کردووە لای خوا لە زینا یان لە ئارەقخواردنەوە یان لە سوویێك گەورەترە، ئەوەتا پێغەمبەری ئەکرەم "صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وسَلَّم" دەفەرموێت: «الرِّبَا سَبْعُونَ حُوبًا اَيْسَرُهَا اَنْ يَنْكِحَ الرَّجُلُ اُمَّه» (ابن ماجة عَنْ اَبِي هُرَيْرَةَ رضي الله عنه).

واتە: سوو حەفتا جۆرو چەشنی هەیە، سووکترینیان وەك ئەوە وایە کە پیاوێك زینا لەگەڵ دایکیدا بکات!!! بۆیە خوای گەورە حوکمی مانەوەی بەردەوامی بۆ ئەو کەسانە داوە کە ڕیبا بە حەڵاڵ دائەنێن، هەروەك دەفەرموێ: ﴿الَّذِينَ يَأْكُلُونَ الرِّبَا لا يَقُومُونَ إِلَّا كَمَا يَقُومُ الَّذِي يَتَخَبَّطُهُ الشَّيْطَانُ مِنَ الْمَسِّ ذَلِكَ بِأَنَّهُمْ قَالُوا إِنَّمَا الْبَيْعُ مِثْلُ الرِّبَا وَأَحَلَّ اللَّهُ الْبَيْعَ وَحَرَّمَ الرِّبَا فَمَنْ جَاءَهُ مَوْعِظَةٌ مِنْ رَبِّهِ فَانْتَهَى فَلَهُ مَا سَلَفَ وَأَمْرُهُ إِلَى اللَّهِ وَمَنْ عَادَ فَأُولَئِكَ أَصْحَابُ النَّارِ هُمْ فِيهَا خَالِدُونَ﴾ (البقرة: 275). واتە: ئەوانەی کە سوو(الربا) دەخۆن ڕاست نابنەوە (لە گۆڕەکانیاندا)! مەگەر چۆن کەسێ ڕاست دەبێتەوە کە شەیتان دەستی لێ وەشاندبێ (وە تووشی فێ بووبێ) ئەوە بەهۆی ئەوەوەیە، سوو خۆران گوتیان: کڕین و فرۆشتن وەك سوو وایە لەکاتێکدا خوا ڕێی داوە بە کڕین و فرۆشتن، بەڵام سووی قەدەغە کردووە، ئینجا ئەو کەسەیئاماۆژگارییەکی لە پەردەوەردگارەوە پێی گەیشت و خێرا دەستی لێ هەڵگرت، ئەوا ئەوەی لەوەپێش وەری گرتووە بۆخۆیەتی(لە سوو خواردن)، وە کاری ئەو حەواڵە بەخوایە، وە ئەوەی گەڕایەوە(بۆ سوو خواردن)، ئا ئەوانە هاوڕێی ئاگرن و بە ئێجگاری تیایا دەمێننەوە. دیارە ئایەتی ﴿أَصْحَابُ النَّارِ هُمْ فِيهَا خَالِدُونَ﴾یش بەڵگەیە لە سەر کافر بوونی ئەو کەسانە. یان کە فەرمووی: ﴿إِنَّمَا الْبَيْعُ مِثْلُ الرِّبَا﴾ بەڵگەیە لەسەر ئەوە کە ئەم کارەیان بە حەڵاڵ زانیوە بۆیە پێیان وابووە کە ڕیباش هەر وەك کڕین و فرۆشتن وایە!

### 3. دۆستایەتی کردنی کافران و پشتگیری کردنیان لەسەر مسوڵمانان!:

هەرکەسێك دۆستایەتی لەگەڵ کافراندا بنوێنێ و پشتیان بگرێت لە دژایەتی کردنی مسوڵمانان، بە بێ هیچ گوکانێك ئەو کەسە کافرەو لە دین دەردەچووە، یاخود کەسانێك بچن جاسووسی لەسەر مسوڵمانان بکەن و نهێنییەکانیان لای دوژمنان بدرکێنن لە کاتی شەڕو ڕووبەڕووبوونەوەی ئەو مسوڵمانانە لەگەڵ دوژمنانیاندا، ئەوە هەمان حوکمی کوفر دەیانگرێتەوە، بۆیە خوا گەورە دەفەرموێت: ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا لا تَتَّخِذُوا الْيَهُودَ وَالنَّصَارَى أَوْلِيَاءَ بَعْضُهُمْ أَوْلِيَاءُ

بَعْضٍ وَمَنْ يَتَوَلَّهُمْ مِنْكُمْ فَإِنَّهُ مِنْهُمْ إِنَّ اللَّهَ لا يَهْدِي الْقَوْمَ الظَّالِمِينَ﴾ (المائدة:51). واتە: ئەی ئەوانەی باوەڕتان هێناوە جوولەکە و گاوور مەکەن بە پشتیوان و خۆشەویستی خۆتان، ئەوانە هەندێکیان دۆستی یەکترن، ئەوەتان ئەوان بکات بە پشتیوان و دۆست؛ ئەوە بەڕاستی ئەو کەسە لەوانە ! بێگومان خوا ڕێنموونی گەلی ستەمکاران ناکات.

ئەمەش بەڵگەیەکی ئاشکرایە کە بەم کارەیان پێی لە ئیسلام دەردەچن، هەروەها دەفەرموێت: ﴿لا يَتَّخِذِ الْمُؤْمِنُونَ الْكَافِرِينَ أَوْلِيَاءَ مِنْ دُونِ الْمُؤْمِنِينَ وَمَنْ يَفْعَلْ ذَلِكَ فَلَيْسَ مِنَ اللَّهِ فِي شَيْءٍ إِلَّا أَنْ تَتَّقُوا مِنْهُمْ تُقَاةً وَيُحَذِّرُكُمُ اللَّهُ نَفْسَهُ﴾ (آل عمران: 28). واتە: نابێ بڕواداران بێ باوەڕان بگرن بە دۆستی خۆیان لەجیاتی بڕواداران وە هەر کەسێك وابکات ئیتر پەیوەستی لەگەڵ خوادا نامێنێ، مەگەر بۆ خۆپاراستنتان بێت لێیان، وە خوا دەتان ترسێنێت لە سزای خۆی. هەروەها ئایەتی: ﴿إِلَّا أَنْ تَتَّقُوا مِنْهُمْ تُقَاةً﴾ بەڵگەیە لەسەر ئەوە کە ئەگەر مسوڵمانێك خۆی لە شەڕی کافران پاراست و پێی خۆش نەبوو کە بێباوەڕان بە سەر مسوڵماناندا زاڵ ببن، بەڵام لە بەر بێهێزی خۆی نەتوانێت کە پشتی مسوڵمانان بگرێت، ئەوە بێگومان ئەو کەسە بیانووی هەیە و لە دینی خوا دەرناچێت، بۆیە بینیمان کە پێغەمبەری ئەکرەم لە حاتەبی کەڕی ئەبی بەڵتەعە خۆش بوو، هەرچەن نهێنی مسوڵمانایشی ئاشکرا کردبوو، ئەو کاتە کە لە پێش فەتحی مەککەدا هەواڵی بۆ قورەیشییەکان ناردبوو کە سوپای مسوڵمانان کۆبوونەتەوە بە تەمای شەڕن! کاتێ کە پێغەمبەری خوا "صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وسَلَّم" زانی کە حاتەب ئەم کارەی لە ترسی منداڵەکانی کردوویەتی کە وان لە شاری مەککەدا، وە لەبەر ئەوەی کە پێشینەیەکی باشی هەبووەو بەشداری شەڕی بەدری کردووە، بۆیە پێغەمبەری خوا "صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وسَلَّم" لێی خۆش بوو.

بەڵام هیچ گومانێك لەوەدا نییە کە ئەگەر مسوڵمانێك پشتی کافران بگرێت و نهێنی مسوڵمانانیان پێ بگەینێت ئەوە کافر دەبێت و لە ئیسلامدا دەردەچێت، بۆیە خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَمَنْ يَتَوَلَّهُمْ مِنْكُمْ فَإِنَّهُ مِنْهُمْ﴾ (المائدة: 51). واتە: ئەوەتان ئەوان بکات بە پشتیوان و دۆستی خۆی ئەوە بەڕاستی ئەو کەسە لەگەڵ ئەوان حسێبی بۆ دەکرێت! بۆیە ئەم سێ خاڵەی سەرەوە، واتە: (تەکفیرکردنی مسوڵمان و حەڵاڵکردنی خوێنی مسوڵمانان و دۆستایەتی کردنی دوژمنانی ئیسلام) خاڵی بنەڕەتین کە لە هەرکەسێکدا بێتەدی، ئەوە وەلائەکەی بۆ ئیسلام و مسوڵمانان دەسڕێتەوە و کافر دەبێت!

**چوارەم: لەکەدارکردنی موالات:**

وەك باسمان کرد کە ئەم خاڵانەی سەرەوە خاڵی بنەڕەتین لە هەڵوەشاندنەوەی موالات، بەڵان هێندێ خاڵی تر هەن کە تەنها لە هێزی وەلاء کەم دەکەنەوە دەنا پێی لە ئیسلام دەرناچن، تەنها مەگەر بە حەڵاڵیان بزانێت، ئەودەم تەوفیرێکی نابێت لەگەڵ خاڵەکانی سەرەوە، ئەوانیش بریتین لە:

**(1) زوڵم زۆرداری:**

بێگومان زوڵم و زۆرداری بە هەر چەشنێکییەوە بێت درووست، هەروەك خوای گەورە لە فەرموودەیەکی قودسیدا دەفەرموێت: «يا عِبَادِي إِنِّي حَرَّمْتُ الظُّلْمَ عَلَى نَفْسِي وَجَعَلْتُهُ بَيْنَكُمْ مُحَرَّماً فَلاَ تَظالُموا» (مسلم وأحمد عن أَبِي ذَرٍّ جُنْدُبِ بنِ جُنَادَةَ "رضي الله عنه"). واتە: ئەی بەندەکانم، من زوڵم و ستەمم لەسەر ئێوە یاساغ کردووە، وە لە نێو خۆتانا گێڕاومە بە حەڕام، کەوابوو ستەم لە یەکتر مەکەن. یان پێغەمبەری خوا "صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وسَلَّم" دەفەرموێت: «المُسْلِمُ أَخو المُسْلِمِ، لا يظْلِمُه، ولا يُسْلِمهُ» (البخاري ومسلم وأبو داود وغيرهم). (پێشتر لێکدراوەتەوە). بۆیە دەبینین بۆ ئەم کارە خوای گەورە تەریقکردنەوەی بۆیان داناوە هەروەك پێغەمبەر "صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وسَلَّم" دەفەرموێت: «مَنِ اقْتَطَعَ حَقَّ امْرِيءٍ مُسْلمٍ بيَمِينِهِ فَقدْ أَوْجَبَ اللَّه لَه النَّارَ، وَحَرَّمَ عَلَيْهِ الْجَنَّةَ، فقال رجُلٌ: وإِنْ كَانَ شَيْئاً يسِيراً يا رسولَ اللَّه ؟ فقال: وإِنْ قَضِيباً مِنْ أَرَاكٍ» (رواه مسلم عن أَبي أُمَامةَ إِيَاسِ بنِ ثعْلَبَةَ الْحَارِثِيِّ رضي اللَّه عنه). واتە: کەسێك بە سوێندی بە درۆ هەقی کەسێکی مسوڵمان دابڕپێنێت، ئەوە خوا ئاگری تێ دەئاڵێنێ و لە بەهەشتیش بێبەشی دەکات، پیاوێك گوتی: ئەگەر شتێکی کەمیش بێت، فەرمووی: ئەگەر پووشێکی ئەڕاکیش بێت! !

**(2) جنێودان و غیبەتکردن و دووزمانی:**

بێگومان بە جنێودان بە مسوڵمان فاسق دەبیت، هەروەك پێغەمبەری نازدار "صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وسَلَّم" دەفەرموێت: «سِباب المُسْلِمِ فُسوقٌ، وقِتَالُهُ كُفْرٌ» (متفقٌ عليه عنِ ابنِ مَسعودٍ رضي اللَّه عَنهُ) (متفق عليه). واتە: جنێودان بە مسوڵمان فاسقبوونە، شەڕکردنیش دەگەڵی کوفرە! بۆیە نەفرەتکردنیش لە مسوڵمان وەك کوشتنی وایە، وەك پێغەمبەری خوا "صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وسَلَّم" ئاماژەی داوەو دەفەرموێت: «....لَعْنُ الْمُؤْمِنِ كَقَتْلِهِ، وَمَنْ رَمَى مُؤْمِنًا

بِكُفْرٍ فَهُوَ كَقَتْلِهِ» (رواه البخاري عن ثَابِتِ بْنِ الضَّحَّاكِ). واتە: نەفرەتکردن لە بڕوادار وەك کوشتنی وایە، وە کەسێك تۆمەتی کوفر بداتە پاڵ بڕوادارێك، ئەوە وەك ئەوە وایە کە کوشتبێتی! وە خوای گەورەش دەفەرموێت: ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا لا يَسْخَرْ قَوْمٌ مِنْ قَوْمٍ عَسَى أَنْ يَكُونُوا خَيْراً مِنْهُمْ وَلا نِسَاءٌ مِنْ نِسَاءٍ عَسَى أَنْ يَكُنَّ خَيْراً مِنْهُنَّ وَلا تَلْمِزُوا أَنْفُسَكُمْ وَلا تَنَابَزُوا بِالْأَلْقَابِ بِئْسَ الِاسْمُ الْفُسُوقُ بَعْدَ الْأِيمَانِ وَمَنْ لَمْ يَتُبْ فَأُولَئِكَ هُمُ الظَّالِمُونَ﴾ (الحجرات: 11). واتە: ئەی ئەوانەی کە باوەڕتان هێناوە با هیچ کۆمەڵ پیاوێك گاڵتە نەکەن بە کۆمەڵێکی تریان، ڕەنگە گاڵتە پێ کراوەکان لە گاڵتەکەرەکان باشتر بن (لای خوا)، وە ژنانێك گاڵتە نەکەن بە ژنانێکی تر، ڕەنگە ئافرەتە گاڵتە پێ کراوەکان لە ئافرەتە گاڵتەکەرەکان باشتر بن، وە تانەو تەشەر لە یەکتری مەدەن (لە نێو خۆیاندا)، ناوو ناتۆرەش لە یەکتری مەنێن، ئای چەند خراپە ناو بردنی پاش باوەڕ هێنان کە گوناهە (بە موسوڵمان بڵێیت کافر، داوێن پیس). جا ئەوەی پەشیمان نەبێتەوە ئەوە ئەوانە هەر خۆیان ستەمکارن.

یان دەفەرموێت: ﴿وَالَّذِينَ يَرْمُونَ الْمُحْصَنَاتِ ثُمَّ لَمْ يَأْتُوا بِأَرْبَعَةِ شُهَدَاءَ فَاجْلِدُوهُمْ ثَمَانِينَ جَلْدَةً وَلا تَقْبَلُوا لَهُمْ شَهَادَةً أَبَداً وَأُولَئِكَ هُمُ الْفَاسِقُونَ﴾ (النور: 4). واتە: ئەوانەی کە تۆمەتی (زینا) دەدەنە پاڵ ئافرەتانی داوێن پاك، لەپاشان چوار شایەت ناهێنن (لەسەر ڕاستی تۆمەتەکانیان) ئەوە هەشتا دار (شەلاق)یان لێ بدەن، ئیتر هەرگیز شایەتیان لێ وەرمەگرن، وە ئەوانە لە سنوور دەرچوون!

یان دەفەرموێت: ﴿وَلا يَغْتَبْ بَعْضُكُمْ بَعْضاً أَيُحِبُّ أَحَدُكُمْ أَنْ يَأْكُلَ لَحْمَ أَخِيهِ مَيْتاً فَكَرِهْتُمُوهُ وَاتَّقُوا اللَّهَ إِنَّ اللَّهَ تَوَّابٌ رَحِيمٌ﴾ (الحجرات: 12). واتە: لە پاشملە بە خراپە باسی یەکتری مەکەن، ئایا کام لە ئێوە پێی خۆشە کە گۆشتی برا (ئایینییەکەی) بخوات؟ بە مردوویی؟! بێگومان قێزتان لێی دێتەوەو پێتان ناخۆشە، وە لەخوا بترسن بێگومان خوا تەوبە گیراکەری بە بەزەییە. بەڵکوو هەتا درووست نییە کە جنێودان بە مسوڵمانان بە حەلاڵ بزانیت یان غیبەتیان یان عەیب لێگرتنیان، هەروەك خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿لا يُحِبُّ اللَّهُ الْجَهْرَ بِالسُّوءِ مِنَ الْقَوْلِ إِلَّا مَنْ ظُلِمَ وَكَانَ اللَّهُ سَمِيعاً عَلِيماً﴾ (النساء: 148). واتە: خوا ئاشکرا کردنی قسەی نا بەجێ و خراپی پێی خۆش نییە، مەگەر کەسێك ستەمی لێکرابێ. (بۆی دروستە خراپەی ستەمکار ئاشکرا کات) وە خوا هەمیشە بیسەری زانایە.

یان دەفەرموێت: ﴿وَلا تَعْتَدُوا إِنَّ اللَّهَ لا يُحِبُّ الْمُعْتَدِينَ﴾ (البقرة: 190). واتە: وە دەستدرێژی مەکەن بەڕاستی خودا دەست درێژی کەرانی خۆش ناوێت. یان دەفەرموێت: ﴿وَلَمَنِ انْتَصَرَ بَعْدَ ظُلْمِهِ فَأُولَئِكَ مَا عَلَيْهِمْ مِنْ سَبِيلٍ * إِنَّمَا السَّبِيلُ عَلَى الَّذِينَ يَظْلِمُونَ النَّاسَ وَيَبْغُونَ فِي الْأَرْضِ بِغَيْرِ الْحَقِّ أُولَئِكَ لَهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ﴾ (الشورى:41-42). واتە: وە

هەر کەس تۆڵە بسێنێ لە پاش ئەوەی ستەمی لێکراوە، ئا ئەوانە هیچ خەتایەکیان لەسەر نییە. خەتا هەر لەسەر ئەو کەسانەیە کە ستەم لە خەڵکی دەکەن وە بە ناهەق خراپەکاریی دەکەن لە زەویدا، ئەوانە سزای زۆر سەختیان بۆ هەیە.

بۆیە خوای پەروەردگار ئارامی و لە سەر خۆیی داناوە تاکوو بەندەکان لە بێ حەوسەڵەیی خۆیان نەکەونە هەڵەی جنێودان و تانەو تەشەرگرتنەوە، وەك دەفەرموێت: ﴿وَلَمَنْ صَبَرَ وَغَفَرَ إِنَّ ذَلِكَ لَمِنْ عَزْمِ الْأُمُورِ﴾ (الشورى: 43).

واتە: وە هەر کەس خۆگرو لێبوردەبێ بەڕاستی ئەمە لە کارە پڕ بایەخ و پەسەندەکانە.

هەروەها سەبارەت بە دووزمانیش پێغەمبەری خوا "صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وسَلَّم" دەفەرموێت: «لاَ يَدْخُلُ الْجَنَّةَ القَتَّاتُ» (رواه البخاري ومسلم وأبو داود والترمذي وأحمد). واتە: ناچێتە بەهەشت کەسێ قسەبێنێ و ببات. قەتتاتیش ئەو کەسانەن کە قسە دەهێنن و دەبەن و دووزمانی دەکەن.

**(3) فرۆشتن لەسەر فرۆشتن و خواستن لەسەر خواستن گوێهەڵقورتاندن و غەش و ناپاکی کردن:**

پێغەمبەری خوا "صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وسَلَّم" هەمیشە ئاگاداری ئەو ئەتوارو ڕەفتارانەی کردووینەوە کە دەبێتە هۆی دڵهێشاندن و دژایەتی و ڕقە بەرایەتی نێوان کەسەکان، ئەمانەی سەرەوە تێکڕا هۆی لە یەکتردوورکەوتنەوەو کینەو بوغزاندنی یەکترە.

پێغەمبەری خوا "صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وسَلَّم" دەفەرموێت: «وَلَا يَبِعْ بَعْضُكُمِ على بيع بَعْضٍ» (البخاري ومسلم والترمذي والنسائي وغيرهم). واتە: با هیچ کامێکتان مامەڵە لەسەر مامەڵەی کەسی ترا نەکات. هەروەها دەفەرموێت: «.. ولا يخطبْ عَلَى خِطْبَةِ أَخِيهِ» (البخاري ومسلم والنسائي وابن ماجه وغيرهم وَعَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رَضِيَ اللَّه عَنْهُ). واتە: وە با لە سەر خوساتنی براکەی نەخوازێ. یان دەفەرموێت: «ولا تناجشُوا» (البخاري ومسلم والترمذي وأحمد وغيرهم عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رَضِيَ اللَّه عَنْهُ). واتە: نرخی کەلوپەل لەسەر یەکتر زیاد مەکەن. (کە ئەمەش جۆرێکە لە هەڕاج!!)

هەروەها دەربارەی خیانەت و ناپاکیش دەفەرموێت: «وَمَنْ غَشَّنَا، فَلَيْسَ مِنَّا» (مسلم والترمذي وأبو داود وغيرهم عَنْ أَبِي هُرَيرةَ رضي اللَّه عنه). واتە: وە ئەوەی ناپاکیمان لەگەڵدا بکات لە ئێمە نییە.

**(4) هەجرو خۆلێکردن:**

بێگومان پێغەمبەری خوا "صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وسَلَّم" سەبارەت بەمە فەرموویەتی: «لا يَحِلُّ لمسْلِمٍ أنْ يهْجُرَ أخَاه فوْقَ ثَلاثٍ ، فمنْ هَجر فَوْقَ ثلاثٍ فمات دخَل النّار». (رواهُ أبو داود بإسْنادٍ على شرْطِ البخاري عَنْ أبي هُرَيرةَ رضي اللَّه عَنه). واتە: درووست نییە بۆ مسوڵمان کە لە سێ ڕۆژ بەرەو ژوور خۆ لە براکەی بگرێت، هەرکەسێك لە سێ ڕۆژان بەرەو ژوور خۆی بگرێت، بمرێت ئەچێتە دۆزەخ.

کەوابوو ئەم کارو ڕەفتارانەی کە باسیش کران کاریگەرییەکی زۆریان هەیە لە سەر بێهێزکردنی موالات.. دیارە کە بکەرەکەشیی لە ئیسلامدا دەرناهێنێت، بەڵام کاریگەری لە سەر سووککردنی موالاتەکە دەبێت.

دیارە زۆر هۆکارو کردەوەی تریش هەن، لەوانە: گاڵتە بەیەککردن و تانەو تەشەر لە یەکتر گرتن و گەڕان بەدوای عەیبی یەکتر، تێکڕایان کەم و زۆر دەچنە نێو ئەم چوارچێوەوە.

**پێنجەم: ئەوکەسانەی لەگەڵ موالات ناکۆکن:**

زۆر چین و توێژ هەن کە ژیان و ئاکاریان دژن بە ئەسڵ و بنجوبنەوانی موالات، لەوانە:

**1. دووڕووەکان:**

هەڵبەت سەرسەختترین چین و توێژ کە دژن بە مولات و بە تەواوی لە چوارچێوەکانی دەردەچن موونافیقەکان، کە لە سەرەوە خۆیان دەگەڵ مسوڵمانان ڕێکدەخەن و ڕێکدەکەون، بەڵام لە ناخەوە بورکانێك ڕق و کینەیان بەرامبەر بە ئیسلام مسوڵمانان هەڵگرتووە! هەموو ڕەفتارو ئاکارێکیان بۆ ئەوەیە کە دەسەڵاتی مسوڵمانان نەهێڵن و شکستیان پێ بهێنن! هەر بۆیە لە کاتی خۆشیدا ئەوەندەی ئەوان دەوری پیلانگێڕی و خراپەیان لە بەرامبەر ئیسلام و مسوڵمان هەبوو نیو هەندە بێباوەڕان نەیانبوو. بۆیە پێغەمبەری خوا "صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وسَلَّم" بەردەوان هۆشداری پێداوین بەرامبەر بەو تاقمە سەرگەردانە، لەوانە دەفەرموێت: «إنَّ اَخْوَفَ مَا اَخَافُ عَلَى اُمَّتِي كُلُّ مُنَافِقٍ عَلِيمِ اللِّسَانِ» (رواه أحمد عَنْ عُمَرَ بْنِ الْخَطَّابِ، رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ). واتە: ترسناکترین شت کە من لە سەر ئوممەتەکەی خۆم لێی بترسم؛ هەموو دووڕوویێکی قسەزانە. ئەم دووڕووانە زۆر چاك دەتوانن زمانی خۆیان خوار بکەنەوەو هەقیقەتەکان بشێوێنن، خەتەرو ترسناکیان لەمەوەیە:چۆنکە مسوڵمانان نایانناسن و بە حاڵی ناخیان بێئاگان، بۆیە

زۆر زوو پێیان باوەڕ دەکەن و لە خشتە دەچن، وەك خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَإِنْ يَقُولُوا تَسْمَعْ لِقَوْلِهِمْ﴾ (المنافقون: 4). واتە: وە ئەگەر قسە بکەن گوێ لە قسەکەیان دەگریت. مەترسیتریان ئەوەیە کە بە درۆ خۆیان لە پۆشاکی ئیمان هەڵدەکێشن، بۆیە زۆر زەحمەت ئاشکرا دەبن، وەك خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَمِنْ أَهْلِ الْمَدِينَةِ مَرَدُوا عَلَى النِّفَاقِ لا تَعْلَمُهُمْ نَحْنُ نَعْلَمُهُمْ﴾ (التوبة: 101). واتە: هەندێك لەخەڵكی مەدینەش لەسەر ناپاکی ڕاهاتوون و خۆیان بۆ تەرخان کردووە تۆ (ئەی موحەمەد "صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وسَلَّم") نایانناسی ئێمە چاك دەیانناسین..

مانای (مردوا)ش واتە: قسەیان نەرم و بە لوتف و شیرینە، زۆر سوێند دەخۆن و شایەتی زۆر ئەهێنن، وەك خوای گەورە باسیان دەکات و دەفەرموێت: ﴿إِذَا جَاءَكَ الْمُنَافِقُونَ قَالُوا نَشْهَدُ إِنَّكَ لَرَسُولُ اللَّهِ وَاللَّهُ يَعْلَمُ إِنَّكَ لَرَسُولُهُ وَاللَّهُ يَشْهَدُ إِنَّ الْمُنَافِقِينَ لَكَاذِبُونَ﴾ (المنافقون: 1). واتە: کاتێك کە دووڕوان بێنە لات دەڵێن شایەتی دەدەین کە بەڕاستی تۆ پێغەمبەری خوایت، وە دیارە خوایش دەزانێ کە تۆ ڕەوانە کراوی ئەوی، وە خوا شایەتی دەدات کە بێگومان دووڕوان درۆزنن. بەڵام بێگومان چونکە پێغەمبەر "صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وسَلَّم" باش لە حاڵیان دەگەیشت بۆیە هێندێ سیفەت و خەسڵەتیانی بۆ جێهێشتووین تاکوو ئاسان بیانناسینەوە، لەوانە دەفەرموێت: «آيَةُ الْمُنَافِقِ ثَلاثٌ: إِذَا حَدَّثَ كَذَبَ، وَإِذَا وَعَدَ أَخْلَفَ، وإِذَا آؤْتُمِنَ خَانَ» (البخاري ومسلم والترمذي عَنْ أَبِي هُرَيرةَ رضي اللَّه عَنه). واتە: نیشانەی بابای دووڕوو سێ شتە: ئەگەر قسەی کرد درۆ دەکات، ئەگەر بەڵێنیدا نایگەیەنێتە جێ، ئەگەر ڕاسپاردەی لا بسپێری ناپاکی تیا ئەکات.

یان دەفەرموێت: «أربع مِنْ كُنَّ فِيهِ كَانَ مُنَافِقاً خَالِصاً . ومنْ كَانَتْ فِيه خَصلَةٌ مِنْهُنَّ كانَتْ فِيهِ خَصْلَة مِن النِّفاقِ حَتَّى يَدَعَهَا : إذا اؤْتُمِنَ خَان ، وإذَا حدَّث كذَبَ ، وَإذا عَاهَدَ غَدَر، وَإذا خَاصَم فَجَرَ» (أخرجه البخاري والنسائي وأحمد عن عبدِ اللَّهِ بن عمرو بن العاص رضي اللَّه عنهما). واتە: چوارشت هەن لەهەر کەسێدا مسۆگەر بێت ئەبێت بە دووڕوویێکی تەواو! هەرکەسێك خەسڵەتێك لەو خەسڵەتانەی تیا مسۆگەر بێت ئەوە خەسڵەتێکی دووڕووی تیایدا مسۆگەر بووە، تا ئەو کاتە لە خۆی دائەڕنێت، (ئەوانیش بریتین لە) ئەگەر ڕاسپاردەی لا سپێردرا ناپاکی تیا ئەکات، ئەگەر قسەی کرد درۆ دەکات، ئەگەر بەڵێنیدا دەیشکێنێ و نایگەیەنێتە سەر، وە ئەگەر ناحەزییشی کرد تێی دەپەڕێنی و وێرانی دەکات.

**2. خەواریجەکان:**

پۆڵی دووەم لەوانەی کە لە بنەڕەتی وەلائەوە دەردەچن؛ خەواریجەکانن، بەو کەسانەش دەگوترێت خەواریج کە زۆر

ئاسان خوێن و ماڵ و ئابڕووی مسوڵمانان حەڵاڵ دەکەن!

ئەسڵی گیرۆدەبوونیشیان بریتییە لە جەهل بە ئیسلام و ئەحکامەکانی، بۆیە بە گوناهێکی بچووک مسوڵمانان لە دین دەبەنە دەرەوەو خوێنیان حەڵاڵ دەکەن!!

مەترسیشیان وێڕای ئەوە کە زۆر ئاسان دەتوانن خوێنی مسوڵمانان حەڵاڵ بکەن، زۆر خێراش خەڵکیش پێیان هەڵدەخەڵەتێن!! چونکە نوێژو تاعەت و گریان و ترسانیان لەخوا لە باقی مسوڵمانان جوانترو زیاتر و بەگوڕتر ئاشکرا بەرچاوترە!! هەروەك پێغەمبەری خوا "صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وسَلَّم" وەسفیان دەکات و دەفەرموێت: «تَحْقِرُونَ صَلَاتَكُمْ مَعَ صَلَاتِهِمْ وَصِيَامَكُمْ مَعَ صِيَامِهِمْ» (مسند امام احمد عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ رضي اللّه عَنه). واتە: ڕق لە نوێژەکانتانە لە بەرامبەر نوێژەکانیان و ڕۆژووەکاتان لە بەرامبەر ڕۆژووەکانیان.

ئاشکرایە کە خەواریج لەسەردەمی پێغەمبەر "صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وسَلَّم" سەریان هەڵداو لەویێ ڕۆژێوە بوونەتە بینەقاقای مسوڵمانان!! وەك لەم فەرموودەدا دەردەکەوێت کە دەفەرموێت: «بَعَثَ عَلِيُّ بْنُ أَبِي طَالِبٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ إِلَى رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ مِنْ الْيَمَنِ بِذُهَيْبَةٍ فِي أَدِيمٍ مَقْرُوظٍ لَمْ تُحَصَّلْ مِنْ تُرَابِهَا قَالَ فَقَسَمَهَا بَيْنَ أَرْبَعَةِ نَفَرٍ بَيْنَ عُيَيْنَةَ بْنِ بَدْرٍ وَأَقْرَعَ بْنِ حابِسٍ وَزَيْدِ الْخَيْلِ وَالرَّابِعُ إِمَّا عَلْقَمَةُ وَإِمَّا عَامِرُ بْنُ الطُّفَيْلِ فَقَالَ رَجُلٌ مِنْ أَصْحَابِهِ كُنَّا نَحْنُ أَحَقَّ بِهَذَا مِنْ هَؤُلَاءِ قَالَ فَبَلَغَ ذَلِكَ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَقَالَ أَلَا تَأْمَنُونِي وَأَنَا أَمِينُ مَنْ فِي السَّمَاءِ يَأْتِينِي خَبَرُ السَّمَاءِ صَبَاحًا وَمَسَاءً قَالَ فَقَامَ رَجُلٌ غَائِرُ الْعَيْنَيْنِ مُشْرِفُ الْوَجْنَتَيْنِ نَاشِزُ الْجَبْهَةِ كَثُّ اللِّحْيَةِ مَحْلُوقُ الرَّأْسِ مُشَمَّرُ الْإِزَارِ فَقَالَ يَا رَسُولَ اللَّهِ اتَّقِ اللَّهَ قَالَ وَيْلَكَ أَوَلَسْتُ أَحَقَّ أَهْلِ الْأَرْضِ أَنْ يَتَّقِيَ اللَّهَ قَالَ ثُمَّ وَلَّى الرَّجُلُ قَالَ خَالِدُ بْنُ الْوَلِيدِ يَا رَسُولَ اللَّهِ أَلَا أَضْرِبُ عُنُقَهُ قَالَ لَا لَعَلَّهُ أَنْ يَكُونَ يُصَلِّي فَقَالَ خَالِدٌ وَكَمْ مِنْ مُصَلٍّ يَقُولُ بِلِسَانِهِ مَا لَيْسَ فِي قَلْبِهِ قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ إِنِّي لَمْ أُومَرْ أَنْ أَنْقُبَ عَنْ قُلُوبِ النَّاسِ وَلَا أَشُقَّ بُطُونَهُمْ قَالَ ثُمَّ نَظَرَ إِلَيْهِ وَهُوَ مُقَفٍّ فَقَالَ إِنَّهُ يَخْرُجُ مِنْ ضِئْضِئِ هَذَا قَوْمٌ يَتْلُونَ كِتَابَ اللَّهِ رَطْبًا لَا يُجَاوِزُ حَنَاجِرَهُمْ يَمْرُقُونَ مِنْ الدِّينِ كَمَا يَمْرُقُ السَّهْمُ مِنْ الرَّمِيَّةِ وَأَظُنُّهُ قَالَ لَئِنْ أَدْرَكْتُهُمْ لَأَقْتُلَنَّهُمْ قَتْلَ ثَمُودَ» (يَقُولُ أخرجه البخاري في صحيح/ 4004 عن أبا سَعِيدٍ الْخُدْرِيَّ رضي الله عنه). واتە: عەلی کوڕی ئەبووتالیب لە یەمەن پارچە زێڕێکی پاڵفتەنەکراو لە پێستێکی خۆشکراو دەئاڵێنێ‌و بۆ پێغەمبەر "صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وسَلَّم" دەنێرێت، ئەڵێ: پێغەمبەریش "صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وسَلَّم" لە سەر چوار کەسانی دابەش کرد، کە بریتی بوون لە: عویەینەی کوڕی بەدرو ئەقرەعی کوڕی حابس و زەیدولخەیل، چوارەم یان عەلقەمە بوو یان

عامری کوڕی توفەیڵ بوو، پیاوێکیش لە یارانی پێغەمبەر "صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وسَلَّم" بەدەنگ هات و گوتی: ئێمە لەوان شیاوتربووین!! قسە دەگاتەوە پێغەمبەر "صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وسَلَّم" و ئەویش فەرمووی: ئایا ئێوە من بەدەست پاك نازانن؟! لە کاتێکدا من دەستپاکی لای ئەو کەسەم کە لە ئاسمانەو بەیانیان و ئێوارن هەواڵی ئاسمانم پێ دەگات؟ لەو کاتە پیاوێك هەڵسایەوە کە چاوەکانی ڕیپۆقاوی بوون، ئێسکەکانی کوڵمەی هەڵتۆقی بوون، نێوچەوانی دەرپەڕیبوون و ڕیشی چڕو قژی پاك تاشی بوو، شەرواڵی لە پای دەخشاو گوتی: لە خوا بترسە ئەی پێغەمبەر! پێغەمبەریش "صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وسَلَّم" فەرمووی: وا وەیلا بەحاڵت! ئایا لە سەر گۆی زەوی لەمن لە خواترستر هەیە؟ ئەڵێ پاشان کابرا ڕۆیشت و خالیدی کوڕی وەلید (خوا لێی ڕازی بێت)؛ فەرمووی: نەچم لە گەردەنی بدەم؟ پێغەمبەریش "صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وسَلَّم" فەرمووی: نەخێر! چون ڕەنگە ئەو نوێژکەر بووبێت؟!!! خالید گوتی: ئاخر چەند نوێژکەر هەن ئەوەی بە زمان دەیڵێن لە دڵیانەوە دەرناچێت؟ پێغەمبەر "صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وسَلَّم" فەرمووی: من فەرمانم پێی نەکراوە کە دڵی بەندەکان بپشکنم و سینەیان هەڵکۆڵم!! پاشان پێغەمبەر "صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وسَلَّم" دیقەتی کابرای ئەدا کە ئەڕۆیشت فەرمووی: لەدوای ئەم پیاوەوە کوڕگەلێ پەیا دەبن کە کتێبی خوا دەخوێننەوە، بەڵام لە قوڕگیان تێپەڕ ناکات، لە دین دەردەچن وەك چۆن تیر لەکەوان دەردەچێت، (وابزانم گوتی:) ئەگەر پێیان بگەم وەك گەلی سەموود دەیانکوژمەوە!!

هەر ئەم کوڕگەلانەبوون لە فیتنەی سەردەمی عوسمان سەریان هەڵداو لە بچووکترین شت عەیبیان لێی دەگرت، لە کاتێك کە عوسمان عەشەرەی موبەششەرە بوو، لە کاتێك کە یەکێك بوو لەوانەی کە بەجۆرێ ماڵی خۆی بۆ خوا بەخش دەکرد کە کەس پێشی نەدەگرتەوە، بەڵام ئەو خەواریجانە هەڵسان میسرو شام و عێراقیان لێی بەئاگا هێنا، لای ئەوانەی کەوا لە پلەو مەقامی عوسمان بێئاگا بوون، وایان لێکرد کە هەموو کەس شانازی بکات کە دەستی لە خوێنی عوسماندا هەبێت!!! بۆیە سەرەنجام کۆمەڵە کەسێکی سەر لێشێواو چوون ماڵی عوسمانیان گەمارۆداو لە پشتەوە دیواریان ماڵیان بڕی و لێی هاتنە ژوورو زۆر بە ناهەق و هەرزان شەهیدیان کرد؟!! بەمە گەورەترین تاوانیان لە مێژوو بەرامبەر بە پاکترین کەس لە سەر زەوی بە ئەنجام گەیاند، لە کاتێ کە هەر دوێنێ شەو تەواوی قورئانی لە یەك ڕکاتدا خوێندبوو؟!!

ئەم خەوارجیانە هەر ئەمانە بوون کەوا هانی (عەلی)یان داو بەیعەتیان پێی بەست، کەچی هەر ئەوانیش پێش

هەمووان بەیعەتیان لەگەڵ هەڵوەشاندەوە!!

ئەمانە ئەوانە بوون کە لە بەردەم (عەلی) وەستان کاتێ ڕەتی کردەوە کە شەڕ ڕابگرێت ئەو کاتەی سوپای موعاویە قورئانیان خستبووە سەر نێزەکانیان، هەتا زەیدی کوڕی خالیدی تائی (کە یەکێك بوو لە سەرانی خەواریج) گوتی: ئەم خەڵکە داوای کتێبی خوامان لێ دەکەن کەچی تۆ داوای شمشێرمان لێ دەکەیت!! عەلی فەرمووی: من لە ئێوە باشتر لە کتێبی خوا حاڵیم، کەچی زەیدی سەرکردەی خەواریج پێی ئەڵێت: ئەشتەر لە شەڕی مسوڵمانان دەگەڕێنیتەوە باشە، دەنا بە دەردی عوسمانت دەبەین (ئەشتەر: سەرکردەیەکی عەلی کوڕی ئەبووتاڵیب بوو بۆ شەڕی موعاویە دەست بەکار بوو) بۆیە عەلی ناچار بوو کە ئەشتەڕ بگێڕێتەوە ئەویش دوای ئەوە کە شکستی بە سوپای موعاویە هێناو کۆمەڵێکی کەم لەوان نەبێت کە مابوونەوە، ئینجا مەسەلەی تەحیکم هاتە پێشێ و حوکمێك درا کە عەلی خۆی پێی ڕازی نەبوو.

**لەگەڵ ئەوە خەواریجەکان هەر خۆیان بوون کە داوایان لە** عەلی دەکرد کە بە تەحیکم ڕازی ببێت، کەچی لە دواییا **کە عەلی حوکمی دەرکرد ئەوان پێیان دەگوت: (لا حکم الا لله) –عەلی–یش دەیفەرموو:** لە پێناو ناهەقییا داوای **هەق دەکەن، هەتا قورئانێکی هێناو گوتی: ئەی قورئان حوکممان لە نێواندا بکە! واتە: قورئان خۆی زمانی** نییە تا **قسە بکەت، خۆ هەردەبێ ئەم قورئانە لەسەر زمانی کەسێکا حوکم بکات،** بۆیە لە کۆتاییا لێك ترازان و سوپاکە **لەت بوو و خوێنی عەبدوڵڵای کوڕی عەبدوڵڵای کوڕی حەڕام حەلاڵ کرد!** کاتێ کە ئەو فەرموودەیان بە عەلی **ڕاگەیاند کە دەفەرموێت:** «إِنَّهَا سَتَكُونُ فِتَنٌ أَلاَ ثُمَّ تَكُونُ فِتْنَةٌ الْقَاعِدُ فِيهَا خَيْرٌ مِنَ الْمَاشِي فِيهَا وَالْمَاشِي فِيهَا خَيْرٌ مِنَ السَّاعِي إِلَيْهَا» (البخاري ومسلم والترمذي وأحمد). **واتە: کۆمەڵە فیتنەو بەڵایەك دێنە پێش،** پاشان بەڵایەك دێتە **پێش، کەوا تێیدا ئەوەی** دانیشتووە باشترە لەوەی کە دەڕوات، ئەوەی کە دەڕوات باشترە لەو کەسەی کە بۆی **دەچێت.. عەلی کوڕی ئەبی تاڵیبیش شەڕی لەگەڵدا کردن و بەسەریاندا زاڵ بوو،** بە جۆرێك کەسیان لێ نەمایەوە **هەر هەمووی کوژران تەنها نۆ کەس نەبێت، لە کاتێك کە ژمارەیان دوازدەهەزار** کەس بوو و چوار هەزاریان **پاشەکشەیان کردو دەستیان لە شەڕکردن لەگەڵ عەلی هەڵگرت و باقی تر شەڕیان کرد.** ئەوەی کە ڕزگاریشی ببو **خوێنی عەلی و موعاویەو عەمری کوڕی عاسییان بە تێکڕا حەڵاڵ کرد،** هەتا خەواریجی گەورەی ئەو سەردەمە **عەبدولڕەحمانی کوڕی مولجەم لە** مانگی ڕەمەزان کاتێ کە عەلی بۆ نوێژی بەیان دەچوو بۆ مزگەوت لە دواوە لێیدا

**و کوشتی!! لە کاتێکدا عەلی باشترین کەس و باشتری پێشەوای مسوڵمانان بوو لەو سەردەمەدا!!**

جا سەیری ئەم تاوانە گەورەو قێزەوینەی ئەو سەردەمە بکەن کە ئەم کوڕگەلانە درێژەیان بە **شەڕی دژ مسوڵمانان** و پێشەواو بڕوادارن دابووێ، **سەیری ئەو گومانە سەیرەی بکوژی عەلییش بکەن کە پێی وابوو خێرێکی زۆر گەورەی** کردووە کە عەلی شەهید کردووە؟!! بۆیە عیمرانی کوڕی حەتتا کە شاعیرێکی خەواریجی ئەو سەردەمە بوو، بەسەر بابای بکوژدا هەڵئەداو دەڵێت:

**ئەم خەنجەرەی وا وەشاندنی ئەو جوامێرە ڕووگەشە**

تا خۆشنوودی ئەوکەس وەرگرێت وا لەسەر عەڕشە

بۆیە عەبدوڵڵای کوڕی موباڕەکیش (ڕەحمەتی خوای لێ بێت)؛ لە شیعرێکا وەڵامی ئەداتەوە دەڵێت:

**بەڵکوو وا بەم کارە دۆزەخی بۆ خۆی گڕدا**

کە دێتەوە دەست؛ هەر تووڕەیی خوای پێ بەشە

هەر ئەم کوڕگەلانە بە درێژایی مێژوو دەستیان لە کوشتن و خوێنی مسوڵمانان هەڵنەگرتووە، **ئەبینین کە لەسەر** دەمی موعاویە جارێکی تر خوێنێکی تریان خستەوە بەر ئاگری فیتنەو تەکفیر کردنی مسوڵمانان!! **لە دوای** ئەمانەوە پێشەوای دەوڵەتە ئیسلامییە**کانی ئەوێ ڕۆژیان بە خۆیانەوە مەشغووڵ دەکرد و بەدڵی خۆیان بە بێ** لەبەرچاوگرتنی چوارچێوە شەرعییەکان بەحسێبی فەتحکردنی وڵاتان گۆماوی خوێنیان بۆ مسوڵمانان سازدەکرد، هەتا هاتنی لە دەوڵەتی عەبباسیش هەر ئەوان زێتر غلوویان لە دینی خوادا دەکرد بە چەشنێ کە **ئاگایان لە** بێباوەڕان بڕابوو تەنها خەریکی ئەهلی ئیسلام بوون!! **هەر ئەوانن لەو ڕۆژەی درووست بوونە تا ئەمڕۆ سبەشی** لەگەڵ دابێت ئەبێ مسوڵمانان بەرەیەکی بەرگری لەخۆکردنیان لە بەرامبەر ئەو خەواریجانە بێت نەکا خوێنیان **حەڵاڵ بکەن و تەکفیریان بکەن!! ئەبینین** لەو سەردەمە غوربەتەی ئیسلامدا ئەبێ بەوەڕابگەین کە شەڕی کوفرو **زاڵمان لە سەرخۆمان سووک بکەینەوە**، کەچی ئەبینین لەگەڵ ئەهلی کوفر بەینیان خۆشەو لەگەڵ ئەهلی ئیسلام **گرژوتاڵن، نهێنی مسوڵمانان ئاشکرا دەکەن و عەیبیان بەگۆڕێ وەردەکەن، خوام لەخوایە کەسێك** لە ڕایەکا **لەگەڵیان یەکنەگرێتەوە ئەوا هاوار بەماڵی ئەگەر خۆی لە چنگیانا ڕزگار نەکات!!**

**نەسیحەت و ئامۆژگاری کردنیان زۆر ئەستەم و مەحاڵە! چون ئەوان بە ئایەتی خواو بە فەرموودەی پێغەمبەری** ئەکرەم "صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وسَلَّم" **قسەدەکەن باس لە شوێنکەوتنی سەلەفی ساڵح دەکەن!** زۆر زەحمەتە **بتوانیت لەگەڵیان ڕێك بکەویت و هەقیان پێ بسەلمێنیت،** چونکە خۆیان بە حاڵی تر لە دینی خوا دەزانن لەکەسێکی **تر، ئەوە نەبوو بە عەلیان دەگوت (لا حکم الا لله) واتە: بە حوکمی عەلی کوڕی ئەبو تاڵیبیش ڕازی نەبوون** کە **خەلیفەی مسوڵمانان و شارەزاتریش بوو لەوان لە دینی خوا!! (خوا پەنامان بدات و گیرۆدەی دەستیان نەبین) ئامین.**

(لێرەوە زیاتری لەسەر ناڵێین، چونکە بابەتی تایبەتی بۆ نووسراوە) .

**دەروازەی دووەم: خۆ بەریکردن (البراء)**

بنچینەیەکی تر لە بنچینەکان بریتییە لە خۆبەریکردن واتە: (البراء)، ئەمیش بریتییە لە هەڵوێستێکی تری موسڵمانان بەرامبەرە بە بێباوەڕان و تاوانباران و یاخی بووان، بۆیە پێش ئەوە باس لە وردودرشتی ئەم بنچینەیەش بکەین، دەبێ سەیرێکی قورئانی پیرۆز و سوننەتی پێغەمبەر بکەین داخوا سەبارەت بەم بنچینەیە چی دەفەرموون؟

یەکەم: بەڵگەکانی خۆبەریکردن لە کتێب و سوننەتدا:

خوای گەورە لە سورەتی (الممتحنة)دا کە لەسەر حاتەبی کوڕی ئەبی بەڵتەعە دابەزی ئەو کاتەی کە هەواڵی سوپای پێغەمبەری بۆ قورەیشییەکان هەنارد کە ئەوە بەتەمان غەزووی مەککە بکەن، هەروەك لە سەحیحی بوخاریشدا داهاتووە کە لە عەلی کوڕی ئەبی تاڵیب دەگێڕنەوە، دەفەرموێت: پێغەمبەری خوا "صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وسَلَّم" من و زوبێرو میقدادی ڕەوان کردو پێی فەرمووین: «بڕۆن تا دەگەن بە ڕەوزەی خاخ کە شوێنێکە لە نێوان مەککەو مەدینە، لەوێ ئافرەتێکی سەرقۆت دەبینن و نامەیکی پێییە لێی بسەنن، ئەڵێ: ئێمەش چووین تا گەیشتین بە ڕەوزەو ئافرەتەکەمان بینی و ڕامانگرت و پێمان گوت: ئەو نامەیە کە لاتە دەری بێنە، ئافرەتەکەش دەڵێت: هیچ

نامەیەکم پێ نییە، ئەڵێ: ئێمەش پێمان گوت: دەری دێنیت یان جلەکانت لەبەر داڕنین؟! ئەڵێ: ئینجا نامەکەی کە لە نێو کەزییەکان گرێدابوو و شاردبوویەوە دەریهێنا، ئەڵێ: نامەکەمان لێ وەرگت و بۆ لای پێغەمبەرمان هێنا "صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وسَلَّم" ئەڵێ: نامەکە ئی حاتەبی کوڕی ئەبی بەلتەعەبوو کە بۆ کۆمەڵێك لە بێباوەڕانی مەککەی ناردبووو هەندێ شتی سەبارەت بە پێغەمبەرو سوپاکەی تیا نووسیبوو! ئەڵێ: پێغەمبەریش حاتەبی بانگ کردوو پێی فەرموو: ئەم نامە چییە حاتەب؟!! ئەڵێ ئەویش گوتی: پەلەم لێ مەکە ئەی پێغەمبەری خوا "صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وسَلَّم" ئینجا گوتی: من یەکێك بووم لە قورەیشییەکان، بەڵام لەگەڵ ئەوانا هامڕا نەبوومە، تۆ کۆمەڵێك موهاجیرت بەدەورەیە، ئەوانیش هەر یەکەو کەسێکیان هەیە لە مەککە کە پارێزگاری لەخاوو خێزانەکان و ماڵ و سامانیان بکەن لە مەککە، ئەڵێ: منیش پێمخۆش بوو خۆ ئەگەر منیش لەو قورەیشییانە هیچ شتێکم نەبێت تا پارێزگاری لە منداڵەکانم بکەن کەچی ئەوەم کرد تا لە بەرامبەر ئەوە ئەوانیش پارێزگاری لە ماڵ و منداڵی من بکەن، من ئەمەشم نەکردووە کە لە بێباوەڕ یان لە دین پاشگەز بووبێتمەوە، ئینجا پێغەمبەری خوا "صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وسَلَّم" فەرمووی: ڕاستت گوت: ئینجا ئەڵێ عومەر فەرمووی: لێمگەڕێ ئەی پێغەمبەری خوا با لە گەردەنی بدەم، ئەڵێ: پێغەمبەری خواش "صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وسَلَّم" فەرمووی: ئاخر ئەو بەشداری شەڕی بەدری کردووە، تۆ چوزانیت ڕەنگە خوا سەیری ئەهلی بەدر بکات و پێیان بفەرموێت: چی ئەکەن بیکەن ئەوە من لێتان خۆش بووم» (رواه البخاري). ئینجا ئەو ئایەتە دابەزی کە دەفەرموێت: ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا لا تَتَّخِذُوا عَدُوِّي وَعَدُوَّكُمْ أَوْلِيَاءَ....﴾ (الممتحنة: 1). واتە: ئەی ئەو کەسانەی کە باوەڕتان هێناوە دوژمنانی من و خۆتان مەکەن بەدۆستی خۆتان، هەروەها ئیبنوعەبباس (خوا لێیان ڕازی بێت)؛ سەبارەت بەم ئایەتەی سوورەتی (الممتحنة) دەفەرموێت: ئەم ئایەتە لەسەر حاتەب دابەزیوە کە دەفەرموێت: ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا لا تَتَّخِذُوا عَدُوِّي وَعَدُوَّكُمْ أَوْلِيَاءَ تُلْقُونَ إِلَيْهِمْ بِالْمَوَدَّةِ وَقَدْ كَفَرُوا بِمَا جَاءَكُمْ مِنَ الْحَقِّ يُخْرِجُونَ الرَّسُولَ وَإِيَّاكُمْ أَنْ تُؤْمِنُوا بِاللَّهِ رَبِّكُمْ إِنْ كُنْتُمْ خَرَجْتُمْ جِهَاداً فِي سَبِيلِي وَابْتِغَاءَ مَرْضَاتِي تُسِرُّونَ إِلَيْهِمْ بِالْمَوَدَّةِ وَأَنَا أَعْلَمُ بِمَا أَخْفَيْتُمْ وَمَا أَعْلَنْتُمْ وَمَنْ يَفْعَلْهُ مِنْكُمْ فَقَدْ ضَلَّ سَوَاءَ السَّبِيلِ﴾ (الممتحنة:1).

واتە: ئەی ئەو کەسانەی کە باوەڕتان هێناوە دوژمنانی من و خۆتان مەکەن بەدۆستی خۆتان دۆستایەتی خۆتانیان بۆ دەنێرن لە کاتێکدا دڵنیاشن ئەوان بێباوەڕن بەو ئایینە ڕاستەی کە بۆتان هاتووە، پێغەمبەر "صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وسَلَّم" و ئێوەش دەردەکەن (لەبەر ئەوەی) کە باوەڕ دەهێنن بە خوای پەروەردگارتان جا ئەگەر دەرچوون لە وڵاتی خۆتان بۆ جەنگکردن لە ڕێی مندا، وە بۆ داواکردنی خۆشنوودی من (دۆستایەتی ئەوان مەکەن)

ڕازو نهێنییان پێ دەڵێن بە دۆستایەتی لە کاتێکدا من پێی ئەزانم بەوەی شاردتانەوە و بەوەی ئاشکراتان کرد، وە هەر کەسێك لە ئێوە دۆستایەتیان بکات ئەوە بێگومان ڕێی ڕاستی ون کردووە.

هەروەها ئەبینین هەر لە سوورەتی (الممتحنة)دا لە ئایەتی دووەمدا خوا (سبحانه وتعالى) ئاگادارمان دەکاتەوە کەوا وریای کافران بین و نەیانکەین بە دۆستی خۆمان، چونکە وەك پێغەمبەر و مسوڵمانانیان لە زێدوشاری خۆیان وەردەنایەو دەریان کردوون کە ئەوان تەنها تاوانیان ئەوە بووە کە باوەڕیان بەخوای تاکوتەنها هێنابوو، فەرمووی: ﴿إِنْ يَثْقَفُوكُمْ يَكُونُوا لَكُمْ أَعْدَاءً وَيَبْسُطُوا إِلَيْكُمْ أَيْدِيَهُمْ وَأَلْسِنَتَهُمْ بِالسُّوءِ وَوَدُّوا لَوْ تَكْفُرُونَ﴾ (الممتحنة: 2)

یانی: ئەگەر ئەوان بۆیان ڕێك بکەوێت دەستو لێناپارێزن، کەوابوو چۆن درووستە کەوا موالاتیان بکەین و دۆستایەتیان لەگەڵدا بکەین و بەدەمیانا پێبکەنین و هاموشۆیان بکەین؟!!

بۆ بەجێگەیاندنی مەرامی خۆبەریکردنیش ئەبینین کەوا لەهەمان سورەت لە لەئایەتی چواردا دەفەرموێت: ﴿قَدْ كَانَتْ لَكُمْ أُسْوَةٌ حَسَنَةٌ فِي إِبْرَاهِيمَ وَالَّذِينَ مَعَهُ إِذْ قَالُوا لِقَوْمِهِمْ إِنَّا بُرَآءُ مِنْكُمْ وَمِمَّا تَعْبُدُونَ مِنْ دُونِ اللَّهِ كَفَرْنَا بِكُمْ وَبَدَا بَيْنَنَا وَبَيْنَكُمُ الْعَدَاوَةُ وَالْبَغْضَاءُ أَبَداً حَتَّى تُؤْمِنُوا بِاللَّهِ وَحْدَهُ إِلَّا قَوْلَ إِبْرَاهِيمَ لِأَبِيهِ لَأَسْتَغْفِرَنَّ لَكَ وَمَا أَمْلِكُ لَكَ مِنَ اللَّهِ مِنْ شَيْءٍ رَبَّنَا عَلَيْكَ تَوَكَّلْنَا وَإِلَيْكَ أَنَبْنَا وَإِلَيْكَ الْمَصِيرُ﴾ (الممتحنة: 4). واتە: بەڕاستی بۆ ئێوە هەیە سەر مەشقێکی جوان و چاك لە ئیبراهیم و ئەوانەی لە گەڵیدا بوون کە بە گەلەکەی خۆیانیان گوت: بەڕاستی ئێمە بێزار و بەرین لە ئێوە، وە لەو شتانەش کە دەیان پەرستن لە جیاتی خوا، ئێمە باوەڕمان نییە بە (ئایینی) ئێوە، وە پەیدا بوو لە نێوان ئێمە و ئێوەدا دژایەتی و کینە بۆ هەمیشە تا کاتێك کە بڕوا بەخوای تەنیا دەهێنن، جگە لەو قسەیەی ئیبراهیم کە بە باوکی گوت: بێگومان داوای لێخۆش بوونت بۆ ئەکەم وە من هیچم بەدەست نییە لە بەرامبەر خوادا، بۆ تۆ ئەی پەروەردگارمان تەنها پشتمان بە تۆ بەستووە، وە هەر بۆ لای تۆ گەڕاوینەتەوە، سەرئەنجامیش هەر بۆ لای تۆیە.

یانی ئەی بڕوادران ئێوەش چاو لە ئیبراهیم و ئەوانەی لەگەڵ ئەو بوون بکەن کە چۆن خۆیان لە بێباوەڕان بەری کرد و ئیعلانی قەراری دژایەتییان لەگەڵ گرتن مادام بێباوەڕن باوەڕیان بەخوای تاکوتەنیا نییە.

هەروەها لە شوێنی تردا دەفەرموێت: ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا لا تَتَّخِذُوا الْيَهُودَ وَالنَّصَارَى أَوْلِيَاءَ بَعْضُهُمْ أَوْلِيَاءُ بَعْضٍ وَمَنْ يَتَوَلَّهُمْ مِنْكُمْ فَإِنَّهُ مِنْهُمْ إِنَّ اللَّهَ لا يَهْدِي الْقَوْمَ الظَّالِمِينَ﴾ (المائدة: 51). واتە: ئەی ئەوانەی باوەڕتان هێناوە جوولەکە

و گاوور مەکەن بە پشتیوان و خۆشەویستی خۆتان، ئەوانە هەندێکیان دۆستی یەکترن، ئەوەتان ئەوان بکات بە پشتیوان و دۆست، ئەوە بەڕاستی ئەو کەسە لەوانە! بێگومان خوا ڕێنموونی گەلی ستەمکارانیش ناکات.

کە دەیشفەرموێت: ﴿وَمَنْ يَتَوَلَّهُمْ مِنْكُمْ فَإِنَّهُ مِنْهُمْ﴾ ئەمە دەقێکی ئاشکرایە کەوا کەسێ جوولەکەو دیانەکان بکات بە دۆستی خۆیان کافر دەبێ و لە دینی خوادا دەردەچێت! یان ئەبینین کە خوای گەورە هەتا بە درووستی نەزانیوە کە باوك و براکان بکرێت بە دۆست و پشتیوان لەکاتێك کە ئەوان حەزیان بە کوفرو سەرگەردانییە زێتر، وە بێباوەڕییان بەسەر دینداریدا هەڵدبژێرن. وەك دەفەرموێت: ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا لا تَتَّخِذُوا آبَاءَكُمْ وَإِخْوَانَكُمْ أَوْلِيَاءَ إِنِ اسْتَحَبُّوا الْكُفْرَ عَلَى الْإِيمَانِ وَمَنْ يَتَوَلَّهُمْ مِنْكُمْ فَأُولَئِكَ هُمُ الظَّالِمُونَ﴾ (التوبة: 23). واتە: ئەی ئەوانەی کە بڕواتان هێناوە باوك و براکانتان دامەنێن (هەڵمەبژێرن) بە دۆست و خۆشەویست ئەگەر بێ باوەڕییان لە باوەڕ لا خۆشەویست ترو چاکتر بوو وە هەر کەس لە ئێوە ئەوانە بکات بە دۆستی خۆی ئەوە هەر ئەوانە ستەمکارن.

یان لە سووڕەتی ئالی عیمڕاندا دەفەرموێت: ﴿لا يَتَّخِذِ الْمُؤْمِنُونَ الْكَافِرِينَ أَوْلِيَاءَ مِنْ دُونِ الْمُؤْمِنِينَ وَمَنْ يَفْعَلْ ذَلِكَ فَلَيْسَ مِنَ اللَّهِ فِي شَيْءٍ إِلَّا أَنْ تَتَّقُوا مِنْهُمْ تُقَاةً وَيُحَذِّرُكُمُ اللَّهُ نَفْسَهُ وَإِلَى اللَّهِ الْمَصِيرُ﴾ (آل عمران: 28). واتە: نابێ بڕواداران بێباوەڕان بگرن بە دۆستی خۆیان لەجیاتی بڕواداران، وە هەر کەسێك وابکات ئیتر پەیوەستی لەگەڵ خوادا نامێنێ، مەگەر بۆ خۆپاراستنتان بێت لێیان، وە خوا دەتان ترسێنێت لە سزای خۆی، وە هەر بۆ لای خوایە گەڕانەوە.

کە دەفەرموێت: ﴿وَمَنْ يَفْعَلْ ذَلِكَ فَلَيْسَ مِنَ اللَّهِ فِي شَيْءٍ﴾ ڕواڵەتەکەی ئەوەی لێ دەفامرێتەوە کەوا ئەوەی وا بکات چ بەشێکی لە دینی خوادا نامێنێت و کافر دەبێت! بۆیە بابای بڕوادار ئەوانەن کە خوا بەجۆرێ وەسفیان دەکات کە قەت ڕۆژێ لە ڕۆژان بیر لەوە ناکەنەوە کە بەدوای کەسانێکەوە عەودالْ بن و خۆشیان بوێن کە دژایەتی خواو پێغەمبەر بکەن، وەك دەفەرموێت: ﴿لا تَجِدُ قَوْماً يُؤْمِنُونَ بِاللَّهِ وَالْيَوْمِ الْآخِرِ يُوَادُّونَ مَنْ حَادَّ اللَّهَ وَرَسُولَهُ وَلَوْ كَانُوا آبَاءَهُمْ أَوْ أَبْنَاءَهُمْ أَوْ إِخْوَانَهُمْ أَوْ عَشِيرَتَهُمْ أُولَئِكَ كَتَبَ فِي قُلُوبِهِمُ الْإِيمَانَ وَأَيَّدَهُمْ بِرُوحٍ مِنْهُ وَيُدْخِلُهُمْ جَنَّاتٍ تَجْرِي مِنْ تَحْتِهَا الْأَنْهَارُ خَالِدِينَ فِيهَا رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمْ وَرَضُوا عَنْهُ أُولَئِكَ حِزْبُ اللَّهِ أَلا إِنَّ حِزْبَ اللَّهِ هُمُ الْمُفْلِحُونَ﴾ (المجادلة: 22).

واتە: کەسانێکت دەست ناکەوێ کە باوەڕیان هەبێت بە خوا و بە ڕۆژی دوایی کە دۆستایەتی بکەن لەگەڵ ئەوانەی دژایەتی خوا و پێغەمبەری خوا دەکەن، هەر چەندە ئەو دوژمنانەش باوکیان بن یا کوڕ و برا و خزمیان بن، ئەوانە خوا باوەڕی لە دڵیاندا چەسپاندووە وە پشتیوانی کردوون بە گیانێك لە لایەن خۆیەوە، وە دەیانخاتە

بەهەشتانێکەوە کە جۆگە ئاوی زۆر دەڕوات بەژێر درەختەکانیاندا. بە هەمیشەیی تێیدا دەمێننەوە، خوا لێیان ڕازی بووە ئەوانیش لە خوا ڕازی بوون، ئەوانە حیزبوڵلان، ئاگادار بن کە تەنها حیزبوڵلا ڕزگار و سەرفرازن.

کەوابوو: هەموو ئەو ئایەتانەی کە تازە هێنامانەوە تێکڕایان دەقی ئاشکران لەوە کە درووست نییە موالات و خۆشەویستی کەسانێك بکەن کە دوژمنی خواو پێغەمبەرن، ئەگەرچی ئەو کەسە نزیکترین کەسیشت بێت وەك باوك و براو خێزان و ئەوانی تر.. بەڵکوو بابای بڕوادرا تەنها دۆستایەتی لەگەڵ دینی خواو ئەهلەکەی دەکات و نوسرەتیان ئەدات و خۆشیانی ئەوێن و پشتگیریان لێ ئەکەن.

**کەوابوو: خۆشەویستان خوێنەرانی هێژاو سەنگین:**

ئێستا کە لەچەمك و واتای خۆبەریکردن حاڵی بووین دەبا چەمکی دۆستایەتی کردن و موالاتکردنی دوژمنان کە **خوای گەورە بەرهەڵستی لێکردووین کە بیکەین چۆنەو چی شتێك دۆستایەتی کردن لەگەڵ دوژمنان و بێباوەڕان دەگرێتەوەو چۆنیش هەقیقەتی خۆبەریکردن لە دوژمنان لە ژیانماند مسۆگەر دەکەین؟**

**ئەڵێین:**

**یەکەم: پابەند بوون بەهەموو ئیسلام واجبە:**

گومان لەوەدا نییە کەوا ئاین و بەرنامەی بێباوەڕان لە هەموو ڕویەکەوە پووچ و بێبایەخە، ئەوانە نەبن کە لەگەڵ فیترەتی سەلیمەوە ڕێکدەکەونەوە. بۆیە لەسەرمانە بەرامبەر بە بێباوەڕان و موشریکەکان هەر ئەوە بڵێین کە خوا فەرموویەتی: ﴿قُلْ يَا أَيُّهَا الْكَافِرُونَ * لا أَعْبُدُ مَا تَعْبُدُونَ﴾ (الكافرون:1-2). واتە: بڵێ: ئەی بێ بڕواییینە. من ئەو(بوتان)ە ناپەرستم کە ئێوە دەی پەرستن. بۆیە خوای پەروەردگار پێغەمبەری خۆی لە زۆر لە ئایەتەکانی خۆی ئاگادارکردۆتەوە کە نەکەن هەرچەند بۆ شتێکی کەمیش بێت پێچەوانەی فەرمانەکانی خواوە هەنگاو بنێن و وەڕێ بکەون، وەك دەفەرموێت: ﴿وَإِنْ كَادُوا لَيَفْتِنُونَكَ عَنِ الَّذِي أَوْحَيْنَا إِلَيْكَ لِتَفْتَرِيَ عَلَيْنَا غَيْرَهُ وَإِذاً لَاتَّخَذُوكَ خَلِيلاً* وَلَوْلا أَنْ ثَبَّتْنَاكَ لَقَدْ كِدْتَ تَرْكَنُ إِلَيْهِمْ شَيْئاً قَلِيلاً﴾ (الاسراء:73-74). واتە: وە بەڕاستی نزیك بوو ئەوانە لات بدەن لەوەی کە

نیگامان کرد بۆت بۆ ئەوەی جگە لە قورئان شتێك بەدەم ئێمە هەڵبەستیت (ئەگەر گوێڕایەڵیان بوویتایە)، ئەوە لەو کاتەدا دەیان کردیت بە دۆست و خۆشەویستی خۆیان. خۆ ئەگەر ئێمە تۆمان دامەزراو نەکردایە بەڕاستی نزیك بوو تۆ کەمێك بەلایاندا بچی.

هەڵبەت ئەمەش هەڕەشەیەکی زۆر توندە بۆ پێغەمبەرەکەی لەوە کە مەیل بەلای کافراندا بکات، هەرچەند لە شتێکی بچووکیشدا بێت! بۆیە فەرمووی: ﴿فَاسْتَقِمْ كَمَا أُمِرْتَ وَمَنْ تَابَ مَعَكَ وَلا تَطْغَوْا إِنَّهُ بِمَا تَعْمَلُونَ بَصِيرٌ * وَلا تَرْكَنُوا إِلَى الَّذِينَ ظَلَمُوا فَتَمَسَّكُمُ النَّارُ وَمَا لَكُمْ مِنْ دُونِ اللَّهِ مِنْ أَوْلِيَاءَ ثُمَّ لا تُنْصَرُونَ﴾ (هود: 112- 113). واتە: کەواتە ڕاستبە بەو شێوەی فەرمانت پێدراوە، وە ئەوانەش تۆبەیان کردووە لەگەڵ تۆدا (و گەڕاونەتەوە) زیادە ڕەوی مەکەن، بەڕاستی ئەو (خوا) بینایە بەهەر کردەوەیەك کە دەیکەن. پاڵ مەدەن بەوانەوە کە ستەمیان کردووە، چونکە دووچاری ئاگری دۆزەخ دەبن و بێجگە لە خوا هیچ پشتیوانێکتان نابێ و پاشانیش یارمەتی نادرێن.

هەروەها فەرمووی: ﴿وَأَنِ احْكُمْ بَيْنَهُمْ بِمَا أَنْزَلَ اللَّهُ وَلا تَتَّبِعْ أَهْوَاءَهُمْ وَاحْذَرْهُمْ أَنْ يَفْتِنُوكَ عَنْ بَعْضِ مَا أَنْزَلَ اللَّهُ إِلَيْكَ﴾ (المائدة: 49). واتە: وە(فەرمانمان پێکردی) کە حوکم بکە لە نێوانیاندا، بەوەی کە خوا ناردوویەتیە خوارەوە و شوێن حەزو ئارەزوویان نەکەوی، وە وریابە لێیان لەوەی بتترازێنن لە هەندێ لەوەی کە خوا ناردوویەتیە خوارەوە بۆت.

بەڕاستی هەموو ئەو ئایەتانە ئەگادارکردنەوەی ئاشکران کەوا هەرکەسێك گوێڕایەڵی بێباوەڕان بکات هەرچەند لە شتێکی کەمیشەوە بێت، پێی تاوانبار دەبێت و لە دینی ڕاستەقینەی خوادا دووردەکەوێتەوە!

گومانیشی تیا نییە کەوا گوێڕایەڵی کردنی بێباوەڕان گەورەترین دۆستایەتی کردنە بۆیان! بەڵکوو گەورەترین هۆکاری کافربوون و دەرچوونە لە ئایین و بەرنامەی خوا.

**دووەم: دەربڕینی خۆ بەری کردن لە بێباوەڕان واجبە:**

وەك لە پێشەوە ڕوونمان کردەوە کەوا بابای مسوڵمان خاوەن ئایینێکی پاك و بێگەردە، بۆیە هەرکەسێك لە مسوڵمانان دوای ئەوە کە بۆی ڕوون بووەوە کە ئایین و بەرنامەی ئیسلام تاکە بەرنامەیەکی بێگەردەو ئەبێ شوێنی

کەویت، بەڵام ڕووی لێ وەربگێڕێت و پشتی تێ بکات، ئەوە پێی کافر دەبێت و لە دینی خوادا دەردەکرێیت! بۆیە هەمیشە مەرجی هاتنە نێو ئاینی ئیسلام و مسوڵمان بوونی بریتییە لە خۆ بەریکردن لە کوفر و بەرنامەو هەرچی شتێکیتر کە ئی ئەوانە ئەبێ خۆتیان لە وەدوورگریت و تخوونیان نەکەویت. هەر بەمەشە ئیمان و باوەڕبوون بە خوا لەدڵدا دەچەسپێ، هەروەك خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿فَمَنْ يَكْفُرْ بِالطَّاغُوتِ وَيُؤْمِنْ بِاللَّهِ فَقَدِ اسْتَمْسَكَ بِالْعُرْوَةِ الْوُثْقَى﴾ (البقرة: 256). (پێشتر ڕاڤە کراوە).

تاغووتیش ئەوانەن کە لە سنوورەکان دەرچوون داواش لەخەڵکی دەکەن کە شوێنیان بکەون و پەیڕەویان بکەن، بۆیە خوای گەورە بە پێغەمبەری فەرمووو: ﴿قُلْ يَا أَيُّهَا الْكَافِرُونَ * لا أَعْبُدُ مَا تَعْبُدُونَ﴾ (الكافرون:1-2). (پێشتر ڕاڤە کراوە).

بۆیە خوا (سبحانە وتعالی) فەرمانی پێکردووین کە وەك ئیبڕاهیم پێغەمبەر (علیه السلام) دژایەتیمان بۆ کوفرو شیرك دەربڕین، وەك فەرمووی: ﴿قَالَ أَفَرَأَيْتُمْ مَا كُنْتُمْ تَعْبُدُونَ * أَنْتُمْ وَآبَاؤُكُمُ الْأَقْدَمُونَ * فَإِنَّهُمْ عَدُوٌّ لِي إِلَّا رَبَّ الْعَالَمِينَ﴾ (الشعراء: 75-76-77). واتە: گوتی ئایا ئێوە دەزانن چی دەپەرستن. ئێوە و باوو باپیرە پێشووەکانتان، جا بەڕاستی هەموو ئەوانە دوژمنی منن جگە لە پەروەردگاری جیهانیان.

یان دەفەرموێ: ﴿كَفَرْنَا بِكُمْ وَبَدَا بَيْنَنَا وَبَيْنَكُمُ الْعَدَاوَةُ وَالْبَغْضَاءُ أَبَداً حَتَّى تُؤْمِنُوا بِاللَّهِ وَحْدَهُ﴾ (الممتحنة: 4). واتە: وە پەیدابوو لە نێوان ئێمە و ئێوەدا دژایەتی و کینە بۆ هەمیشە تا کاتێك کە بڕوا بەخوای تەنیا دەهێنن، بۆیە ئیبڕاهیم (علیه السلام) هەمیشە بۆتە پێشەنگ و چاوساغی ئوممەتی تەوحید و ئەهلی ئیمان. بۆیە ئیعلانکردنی بەڕائەت بۆ ئەهلی کوفر لەسەر بڕواداران پێویستە و لە ژێر هەرناوێکەوە بێت نابێت کە منجەمنجی تیا بکەن. هەرکەسێك کە ڕێگەی ڕاستی گرتبێت و ڕێنماییەکانی پێغەمبەری وەرگرتبێت، ئەوە لەسەری واجب دەبێت کەوا ئیعلانی بەڕائەت لە کافران و موخالیفین بکات.

**سێیەم: پشتگیری کردن و یارمەتیدانی بێباوەڕان حەڕامە:**

یەکێکی تر لە بەڕائەت نواندن بۆ بێباوەڕان بریتییە لەوە کە پشتگیریان نەکەیت و بەدەمیانەوە نەچیت، بەتایبەت

نابێت کە لەسەر دژایەتی کردنیان بۆ مسوڵمان پشتگیریان بکەیت و یارمەتییان بدەیت.

دەی ئەگەر خوێن و ماڵ و ئابڕووی مسوڵمان لەسەر مسوڵمان حەرام بێت، یان جنێو دان بە مسوڵمان فاسقبوون بێت، پچڕاندنی یان نەگەیاندنی هەقەکانیان مایەی شەرمەزاری و چوونە دۆزەخ بێت، یان وەك کوشتنی وابێت، ئەوە بێگومان یارمەتیدانی بێباوەڕان بۆ دژایەتیکردنی مسوڵمانان کوفرەو پێی لە ئیسلام دەردەچیت، یان پاشگەزبوونەوەیە لە ئیسلام، بەڵگەش بۆ ئەمە ئەو ئایەتەیە کە دەفەرموێت: ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا لا تَتَّخِذُوا الْيَهُودَ وَالنَّصَارَى أَوْلِيَاءَ بَعْضُهُمْ أَوْلِيَاءُ بَعْضٍ وَمَنْ يَتَوَلَّهُمْ مِنْكُمْ فَإِنَّهُ مِنْهُمْ إِنَّ اللَّهَ لا يَهْدِي الْقَوْمَ الظَّالِمِينَ﴾ (المائدة: 51). (پێشتر ڕاڤەکراوە)

یاخود ئەو ئایەتانەی کە لە سووڕەتی مومتەحینە سەبارەت بە حاتەبی کوڕی ئەبی بەلّتەعە هێنامانەوە کە نهێنی پێغەمبەری ئاشکراکردبوو و بە بێباوەڕانی ڕاگەیاندبوو، بینیمان کە خەریك بوو قیامەت هەڵبسێت، خۆ ئەگەر لەبەر ئەوە نەبوایە کە بەشداری بەدری کردووە کە ڕەنگە بەمە خوا لێیان خۆش ببێت، دەنا دەمێك بوو خوێنی حەڵاڵ کرابوو! ! بۆیە خوای پەروەدگار بە هیچ جۆرێك ڕێگەی بەوە نەداوە کە لە بەرژەوەندی کافران لەسەر دژایەتی کردنی مسوڵمانان یارمەتییان دەیت! هەتا درووست نییە بۆ ئەوانەی کە موستەزعەف و بێدەسەڵاتن و لە وڵاتی خۆیان ماونەتەوە نەیانتوانیوە کە دەربچن و دەسەڵاتی کوفریشی تیا باڵادەستە کەچی بچن لە دوای مسوڵمانان یارمەتی کوفر بدەن یان کۆمەکیان بدەن، بۆیە خوای گەورە فەرمووی: ﴿سَتَجِدُونَ آخَرِينَ يُرِيدُونَ أَنْ يَأْمَنُوكُمْ وَيَأْمَنُوا قَوْمَهُمْ كُلَّ مَا رُدُّوا إِلَى الْفِتْنَةِ أُرْكِسُوا فِيهَا فَإِنْ لَمْ يَعْتَزِلُوكُمْ وَيُلْقُوا إِلَيْكُمُ السَّلَمَ وَيَكُفُّوا أَيْدِيَهُمْ فَخُذُوهُمْ وَاقْتُلُوهُمْ حَيْثُ ثَقِفْتُمُوهُمْ وَأُولَئِكُمْ جَعَلْنَا لَكُمْ عَلَيْهِمْ سُلْطَاناً مُبِيناً﴾ (النساء: 91). واتە: لەمەولاکەسانێکی تر دەبینن کە دەیانەوێت لە ئێوە ئەمین بن وە لە هۆزەکەی خۆشیان ئەمین بن، هەر کاتێك بانگ کرابن بۆ بێباوەڕی و بوتپەرستی گەڕاونەتەوە بۆی، جا ئەگەر کەنارگیر نەبوون لێتان وە جڵەوی ئاشتیان نەدایە دەستتان وە دەستیان نەکێشایەوە(لە جەنگ کردن)، ئەوە بە دیل بیانگرن و بیانکوژن لە هەر شوێنێك کە بەردەستتان کەوتن، ئەوانەی (باسمان کرد) داومانە بە ئێوە لە دژیان دەسەڵاتی ئاشکرا. مەبەستیش لە فیتنە لێرە شەڕکردنە لەگەڵ مسوڵمانان.

**چوارەم: گێڕانی بێباوەڕان بە نهێنپارێزو ڕاسگریی حەرامە:**

چوارەم شت  کە خوای گەورە لە بەرامبەر بێباوەڕان بەرهەڵستی لێکردووین کە بیکەین، بریتییە لەوە کە نهێنی خۆمانیان لا بدرکێنین و بیانکەین بە جێگەی ڕازو نیازو نهێنییەکانمان، یان ڕاویژیان پێ بکەین و پەسندێتی کارەکانمانیان پێ بسپێرین!! بۆیە خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا لا تَتَّخِذُوا بِطَانَةً مِنْ دُونِكُمْ لا يَأْلُونَكُمْ خَبَالاً وَدُّوا مَا عَنِتُّمْ قَدْ بَدَتِ الْبَغْضَاءُ مِنْ أَفْوَاهِهِمْ وَمَا تُخْفِي صُدُورُهُمْ أَكْبَرُ قَدْ بَيَّنَّا لَكُمُ الْآيَاتِ إِنْ كُنْتُمْ تَعْقِلُونَ﴾ (آل عمران: 118). واتە: ئەی کەسانێ کە بڕواتان هێناوە مەگرن بۆ خۆتان دۆستی گیانی بە گیانی کە جگە لە خۆتان دریغیتان لێ ناکەن لە هیچ شەڕ و خراپەیەك، وە ئاواتە خوازی ناخۆشیتانن، بێگومان دەرئەکەوێت خەشم و قین لە(قسەکانی) دەمیانەوە وە ئەوەی لە دڵیاندا شاردویانەتەوە گەورەترە، بەڕاستی بەڵگەکانمان بۆ ڕوون کردونەتەوە ئەگەر ئێوە ژیربن. بۆیە دەبینین کەوا پێغەمبەری خواو خەلیفە ڕاشیدینەکان بە غەیرەز مسوڵمانان کەسیان نەکردووە بە پێشەوای مسوڵمانان و سپاردەپارێزی بەیتولمال و کاروباری مسوڵمانان، وە نەیانکردوون بە نهێنی گرو پاراستنی ڕازی نیازەکانی خۆیان، بینیمان بەم هەڵوێستە مەردانەیان کە لەدەرهەق بێباوەڕان هەیانبوو، چ سەردەمێکی زێڕین و شارستانییەتی بەهێزی بۆ درووست کردن، بەڵام لەدوای ئەوان کە خەلیفەی تر هاتن و بێباوەڕانیان کرد بەسەروکارو بەڕێوەبردنی دامودەزگاکانیان، بینیمان کە حاڵەتی مسوڵمانانیان بە چ ئاقارێکەوە برد!!

چونکە ئەوەمان بۆ ڕوون بووەوە کەوا موالاتکردنی بێباوەڕان بریتییە لە نەرمی کێشان و لەبەرداهێنان (التنازل) بۆیان، بۆیە خۆشویستنیان واتە: خۆشویستنی ئەو کارانەیش کە پێیەوە سەرگەرم و سەرقاڵن! بۆیە بە هیچ جۆرێك درووست نییە کە بیانکەین بە بیتانەی خۆمان و لە دژایەتی کردنی مسوڵمانان هاوکاریان بکەین و پشتگیریان لێ بکەین.

### ئەم حاڵەتانە چین کە دژ نین لەگەڵ ئەسڵی بەڕائەت و دژایەتیمان لەگەڵ بێباوەڕان؟

وەك لە پێشەوە بۆمان ڕوون بووەوە کە بەهیچ جۆرێك درووست نییە کە کافرانمان خۆش بوێن و دۆستایەتییان لەگەڵدا بنوێنین، ئەوەشمان ڕوونکردەوە کەوا کردنیان بە سەروکارو نهێنپارێزی خۆمان ئەسڵی وەلائمان لێ هەڵدەوەشێنێتەوەو لە گەڵ کوفرو سەرگەردانیان بەشدار دەبین و لای خوا لەیەك تەرازوو حسێبمان بۆ دەکرێت.

بەڵام هەڵبەت حاڵەت و شێوەی تایبەت و ئیستیسناش هەیە کە کەموزۆر ناکەونە بەر دۆستایەتی نواندنمان بۆیان، لەوانە:

**یەکەم: نەرمی نواندن لەکاتی بانگەوازو بانگکردنیان بۆ ئیسلام:**

هەڵبەت ئەم کارە نەك درووستە بەڵکوو لەهەندێ کاتیشدا واجبە کە بابای بانگەوازکار بۆ سەرکەوتنی بانگەوازەکەی ئەبێ بیگرێتە بەر. خوای گەورەش فەرموویەتی: ﴿ادْعُ إِلَى سَبِيلِ رَبِّكَ بِالْحِكْمَةِ وَالْمَوْعِظَةِ الْحَسَنَةِ وَجَادِلْهُمْ بِالَّتِي هِيَ أَحْسَنُ إِنَّ رَبَّكَ هُوَ أَعْلَمُ بِمَنْ ضَلَّ عَنْ سَبِيلِهِ وَهُوَ أَعْلَمُ بِالْمُهْتَدِينَ﴾ (النحل: 125). واتە: خەڵکی بانگ بکە بۆ رێگەی پەروەردگارت بە لێزانی و دانایی و ئامۆژگاری چاك و شیرین وە لە گەڵیان بدوێ (موجادەلە بکە) بدوێ بەچاکترین شێوە، بێگومان پەروەردگارت خۆی چاك دەزانێ بەوانەی گومڕابوون و لایاندا وە لە ڕێگاکەی وە هەر خۆشی زانایە بەوانەی لەسەر ڕێگای ڕاستن.

بۆیە هەمیشە نەفسە پیسەکان و دڵە ڕەقەکان ناگەڕێنەوە بۆ ئیسلام تەنها بەنەرمی و لێزانین و لەسەر خۆیی نەبێت. بۆیە خوای گەورە بە موسا و هاروونی فەرموو کاتێك کە بۆ لای فیرعەونی ڕەوانکردن، پێی فەرموون: ﴿فَقُولا لَهُ قَوْلاً لَيِّناً لَعَلَّهُ يَتَذَكَّرُ أَوْ يَخْشَى﴾ (طــه: 44). واتە: جا قسەی لەگەڵ بکەن بە نەرمونیانی، بەڵکوو بیر بکاتەوە یا بترسێ لە سزای خوا.

بۆیە موساش وای کرد لەگەڵ فیرعەون، وەك خوا پێی فەرمووبوو، بە نەرمی و لەسەر خۆی و بە لێزانی لەگەڵی ئەدواو ئاخاوتنی لەگەڵ دەکرد، هەر ئەم شێوازەش بوو کە پێغەمبەری خوا "صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وسَلَّم" بۆ بانگکرندنی سەرانی مەککە و جوولەکەو نەسارا و بێباوەڕانی مەدینە بۆ ئیسلام گرتییە بەر و پەیڕەوی کرد، چونکە خوای گەورە پێی فەرمووو: ﴿وَلا تُجَادِلُوا أَهْلَ الْكِتَابِ إِلَّا بِالَّتِي هِيَ أَحْسَنُ إِلَّا الَّذِينَ ظَلَمُوا مِنْهُمْ﴾ (العنكبوت: 46). واتە: دەمەقاڵێ و موجادەلە مەکەن لەگەڵ خاوەنی کتێبە ئاسمانییەکاندا مەگەر بە جوانترین شێوە، جگە لەوانەیان کە ستەمیان کرد (لە ئێوە). یان فەرمووی: ﴿ادْعُ إِلَى سَبِيلِ رَبِّكَ بِالْحِكْمَةِ وَالْمَوْعِظَةِ﴾ (النحل: 125). یان فەرمووی: ﴿وَاصْبِرْ عَلَى مَا يَقُولُونَ وَاهْجُرْهُمْ هَجْراً جَمِيلاً﴾ (المزمل: 10). واتە: دان بەخۆتدا بگرە لەسەر ئەو قسانەی کە دەیڵێن وە وازیان لێ بێنەو لێیان گەڕێ بە واز لێهێنانێکی جوان.

هەموو ئەو ئایەتانە و سەدانی تریش لە قورئانی پیرۆز هانی بانگەوازگاران دەدەن کە نەرمونیان و لەسەرخۆبن لە دەمی بانگەوازکردندا، هەموو ئەمانەش هەڵبەت دژ نین لەگەڵ ئایەتەکانی وەك ﴿يَا أَيُّهَا النَّبِيُّ جَاهِدِ الْكُفَّارَ وَالْمُنَافِقِينَ وَاغْلُظْ عَلَيْهِمْ وَمَأْوَاهُمْ جَهَنَّمُ وَبِئْسَ الْمَصِيرُ﴾ (التوبة: 73). واتە: ئەی پێغەمبەر "صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وسَلَّم" جیهاد بکە دژی بێباوەڕان و دووڕووان، وە توندوتیژ بە لە دژیان، شوێنی حەوانەوەی ئەوانە دۆزەخە کە دواڕۆژ و چارە نوسێکی خراپە.

چونکە ڕەقی و توندوتیژی لێرە مەبەستی لە دەمی شەڕو ڕووبەڕووبوونەوەی بێباوەڕانە لە مەیدانی شەڕدا.

یان ئایەتی: ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا قَاتِلُوا الَّذِينَ يَلُونَكُمْ مِنَ الْكُفَّارِ وَلْيَجِدُوا فِيكُمْ غِلْظَةً﴾ (التوبة: 123). واتە: ئەی ئەوانەی کە ئیمانتان هێناوە بجەنگن لە دژی ئەوانەی کە نزیکن لێتانەوە لە بێباوەڕان لە ئێوە، وەبا توندوتیژیتان لێ ببینن.

ئەمیشیان هەمدیس لە کاتی دەبەرێکراچوون و ڕووبەڕووبوونەوەیە لە دەمی شەڕوکوشتاردا. یان دەبینین کە پێغەمبەری خوا هەر لەمەیدانی شەڕدا هەمیشە هانی یارانی خۆی داوە کە زۆر مەردانە شەڕ بکەن و چاو لێکنەدەن، لە وانە دەیفەرموو: «واللهِ لا يَقْتُلُ رَجُلٌ مِنْكُمْ الْيَوْمَ مُقْبِلٌ غَيْرُ مُدْبِرٍ إلاَّ دَخَلَ الْجَنَّة» (رواه أبو إسحاق. انظر البداية والنهاية 3/276-277).. واتە: بەوخوایە هەر پیاوێ لە ئێوە بجەنگێ و هێرش بەرێ و ڕانەکات دەچێتە بەهەشت. بەڵام هەرکە شەڕ لە نێوان مسوڵمانان و بێباوڕان وەستا، ئەوە دوای ئەوە هەمان لوتف و نەرمیی نواندنەکان لە بەرژەوەندی بانگەوازی ئیسلامیی دووبارە دەبنەوە، بۆیە دەبینین لە دوای شەڕی بەدر کاتێ کە بێباوەڕان شکستیان تیا هێناو حەفتا کەسیان لێ بە دیل گیرا، دەبینین کە پێغەمبەری خواو یارانی ئەوپەڕی نەرمییان لەگەڵدا نواندن، برینداڕەکانیان تیمارکردن، تێنووەکانیان ئاودان، برسییەکانیان تێرکردن! پێغەمبەری خوا "صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وسَلَّم" فەرمووی: «اكْرِمُوا الأَسْرَى» (الترمذي وأبو داود). واتە: ڕێز لە دیلەکان بگرن. هەتا هێندێ لە یارانی ئیسیاریان لەگەڵ دیلەکاندا بەکارهێنا، واتە: ئەوانیان بەسەر خۆدا هەڵبژارد لە خواردنێکی باش کە هەبووبێت، پێشی خۆیان ئەیاندا بەوان! هەتا دەبینین کە قورئانی پیرۆز باس لە جوامێری و نەرمی نواندنی باوەڕداران دەکات بەرامبەر بە دیلە بێباوەڕان، وەك دەفەرموێت: ﴿يَا أَيُّهَا النَّبِيُّ قُلْ لِمَنْ فِي أَيْدِيكُمْ مِنَ الْأَسْرَى إِنْ يَعْلَمِ اللَّهُ فِي قُلُوبِكُمْ خَيْراً يُؤْتِكُمْ خَيْراً مِمَّا أُخِذَ مِنْكُمْ وَيَغْفِرْ لَكُمْ وَاللَّهُ غَفُورٌ رَحِيمٌ﴾ (الأنفال: 70 ). واتە:

ئەی پێغەمبەر "صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وسَلَّم" بلێ بەوانەی کە لەژێر دەستتان دان لە دیلەکان ئەگەر خوا بزانێ لە دڵەکانتاندا چاکەیەك هەیە پێتان دەبەخشێ، چاکتر لەو (فیدیە) ی لێتان وەرگیراوە وە لێتان دەبورێ، وە خوا لێبوردەی میهرەبانە. ئەمەش ئەوپەڕی نەرمیی و بەزەیی نواندنە بۆ بانگکردنیان بۆ ئیسلام، بۆیە خوای پەروەردگار لە ڕێگەی فیدیەو ئەو ماڵەی لێیان وەرگیراوە بۆیان قەرەبوو دەکاتەوە. لێرەشەوە بۆمان ڕوون دەبێتەوە کە مەقامی قیتال تەوفیری هەیە لەگەڵ مەقامی بانگەوازدا.

واتە: لە ئانی بانگەوازکردندا بۆ خوا نەرمی و لە سەرخۆیی و بەزەیی بەسەر شتەکاندا زاڵە. بۆیە هەر لەم کاتەدا ئەبینین خواو پێغەمبەری خوا "صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وسَلَّم" هەمیشە بەندەکانی خوایان بۆ ئەوە هانداوە کە حەکیم و کارزان و لەسەر خۆو نەرمونیان بن، بەڵکوو لەم ڕێگەوە خەڵکە لاڕێبووەکان بگەڕێننەوە نێو دادگەری ئیسلام، هەر بەمەش دڵە تەختەکان و خەوتووەکان هەڵدەسنەوەو بە ئاگادێنەوە.

بەڵام نەفامان بەم جیاوازییەی نێوان مەقامی بانگەواز و شەڕو کوشتاردا بێ ئاگان، وا دەزانن کەوا بەرائەت کردن لە بێباوەڕان واتە جنێو پێدان و سوکایەتی کردن و ئازار پێگەیاندنیان. ئەمەش ئەو پەڕی ناحاڵی بوونە بەرامبەر بە هەقیقەتی ئیسلام، وەك لە تەواوی بەڵگەکان بۆمان ئاشکرا بوو کە پێغەمبەری خوا "صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وسَلَّم" لە دەمی شەڕو دەبەرێکڕاچووندا چەندە توندوتیژو بە عیززەت بوو، لە دەمی ئاسایی و مامەڵەو بانگەوازیشدا چەندە نەرمونیان و لە سەرخۆ بوو.

**دووەم: خواستنی ئافرەت و خواردنی دەستی کیتابیان درووستە:**

هەڵبەت کە دەڵێین: کیتابی واتە گاورو جوولەکەکان، ئەوانەی کە خوا حوکمی کوفرو مانەوەی هەتاهەتایی دۆزەخییانی بۆ بڕیار داوە، ئەوانەی کە گوێیان لە ئیسلام بوو کەچی باوەڕیان پێ نەهێنا. وەك خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿لَقَدْ كَفَرَ الَّذِينَ قَالُوا إِنَّ اللَّهَ هُوَ الْمَسِيحُ ابْنُ مَرْيَمَ وَقَالَ الْمَسِيحُ يَا بَنِي إِسْرَائِيلَ اعْبُدُوا اللَّهَ رَبِّي وَرَبَّكُمْ إِنَّهُ مَنْ يُشْرِكْ بِاللَّهِ فَقَدْ حَرَّمَ اللَّهُ عَلَيْهِ الْجَنَّةَ وَمَأْوَاهُ النَّارُ وَمَا لِلظَّالِمِينَ مِنْ أَنْصَارٍ * لَقَدْ كَفَرَ الَّذِينَ قَالُوا إِنَّ اللَّهَ ثَالِثُ ثَلَاثَةٍ وَمَا مِنْ إِلَهٍ إِلَّا إِلَهٌ وَاحِدٌ وَإِنْ لَمْ يَنْتَهُوا عَمَّا يَقُولُونَ لَيَمَسَّنَّ الَّذِينَ كَفَرُوا مِنْهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ﴾ (المائدة: 72-73). واتە: سوێندبێت بێگومان بێ باوەڕبوون ئەوانەی کە گوتیان بێگومان خوا مەسیحی کوڕی مەریەمە! لە کاتێکدا

مەسیح(کاتێ ڕەوانە کرا) گوتی: ئەی نەوەی ئیسرائیل تەنها خوا بپەرستن کە پەروەردگاری من و ئێوەشە، بەڕاستی هەر کەس هاوبەش بۆ خوا دابنێ ئەوە بێگومان خوا بەهەشتی لێ حەرام کردووە، وە جێ و شوێنی ئاگر دەبێت وە بۆ ئەو ستەمکارانە هیچ یارمەتی دەرێك نییە. سوێند بەخوا بەڕاستی بێباوەڕبوون ئەوانەی کە گوتیان: بێگومان خوا یەکێکە لەو سێ خوا(کە بریتین لە پەروەردگار و عیسا و دایکی) لە کاتێکدا هیچ پەرستراوێك نییە بێجگەلە تەنیا خوایەك، وە ئەگەر واز نەهێنن لەو گوتە ناڕەواو بەدانە؛ سوێند بەخوا دووچاری ئەوانەیان ئەبێ کە بێباوەڕ بوون لە سزایەکی بە ئازار و سەخت.

ئەمەش دەقێکی ئاشکرایە سەبارەت لە کوفری جوولەکەو دیانەکانە لە بەر ئەم هەموو قەسەوقسەلۆکەی کە ئەیدەنە پاڵ خوای (سبحانە وتعالى)، بۆیە ئێمەش هەر بە ئەهلی کیتابیان دەزانین هەرچەند ئەم سیفتانەشیان تێدا مسۆگەربیوو. چونکە لەگەڵ ئەم هەموو کوفرەی کە هەیانبوو، کەچی خودا هەر بە خاوەن کتێب ناوی دەهێنان. وەك خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿يَا أَهْلَ الْكِتَابِ لا تَغْلُوا فِي دِينِكُمْ وَلا تَقُولُوا عَلَى اللَّهِ إِلَّا الْحَقَّ إِنَّمَا الْمَسِيحُ عِيسَى ابْنُ مَرْيَمَ رَسُولُ اللَّهِ وَكَلِمَتُهُ أَلْقَاهَا إِلَى مَرْيَمَ وَرُوحٌ مِنْهُ فَآمِنُوا بِاللَّهِ وَرُسُلِهِ وَلا تَقُولُوا ثَلاثَةٌ انْتَهُوا خَيْراً لَكُمْ إِنَّمَا اللَّهُ إِلَهٌ وَاحِدٌ سُبْحَانَهُ أَنْ يَكُونَ لَهُ وَلَدٌ لَهُ مَا فِي السَّمَاوَاتِ وَمَا فِي الْأَرْضِ وَكَفَى بِاللَّهِ وَكِيلاً﴾ (النساء: 171). واتە: ئەی کەسانێ ئەهلی کتێب! هەڵڕۆیی لە دینی خۆتاندا مەکەن؛ جگە لە ڕاست دەربارەی خودا مەبێژن. ئاشکرایە کە مەسیحی کوڕی مەریەم پێغەمبەری خودا بووە، خودا بە فەرمانی خۆی و هەر لە نەفسی پیرۆزی خۆی هاویتیە ناو تۆلی مەریەم، دەسا ئێوە باوەڕتان بە خودا هەبێ و بە پێغەمبەرانی ئەویش بڕوابێنن و مەبێژن سێن. واز لەم قسانە بهێنن؛ کە بۆ ئێوە چاکترە. دیارە هەر خوایەکتان هەیە و ئەویش لەوتۆمەتە دوورە کە هیچ فرزەندێکی هەبێ، هەرچی لە ناو ئاسمانان و زەمیندایە، هەر بۆ ئەوە. بۆپێکهێنانی کاروبار هەر خۆی بەسە.

**سەرنج بدەن**: چۆن لەگەڵ ئەم کوفرەی کە دەیانکرد کەچی خوا هەر بە ئەهلی کتێب ناوی دەهێنان، بۆیەش دەبینین کەوا خوای گەورە بە درووستی زانیوە کە ژنیان لێ بهێنیت و خواردنی دەستیان بخۆیت.

وەك دەفەرموێت: ﴿الْيَوْمَ أُحِلَّ لَكُمُ الطَّيِّبَاتُ وَطَعَامُ الَّذِينَ أُوتُوا الْكِتَابَ حِلٌّ لَكُمْ وَطَعَامُكُمْ حِلٌّ لَهُمْ وَالْمُحْصَنَاتُ مِنَ الْمُؤْمِنَاتِ وَالْمُحْصَنَاتُ مِنَ الَّذِينَ أُوتُوا الْكِتَابَ مِنْ قَبْلِكُمْ إِذَا آتَيْتُمُوهُنَّ أُجُورَهُنَّ مُحْصِنِينَ غَيْرَ مُسَافِحِينَ وَلا مُتَّخِذِي أَخْدَانٍ وَمَنْ يَكْفُرْ بِالْأِيمَانِ فَقَدْ حَبِطَ عَمَلُهُ وَهُوَ فِي الْآخِرَةِ مِنَ الْخَاسِرِينَ﴾ (المائدة: 5). واتە: ئەمڕۆ حەڵاڵ کراوە بۆتان

خۆراکە پاك و خاوێنەکان وە خۆراکی ئەوانەی نامەیان پیێ دراوە حەلاڵە بۆتان وە خۆراکی ئێوەش حەلاڵە بۆ ئەوان، وە ئافرەتانی(ئازادی) داوێنپاك لە ئیمانداران (حەلاڵ بۆتان)، هەروەها ئافرەتانی (ئازادی) داوێن پاك لە نامەدارانی پێش ئێوە ئەگەر ئێوە مارەیی یەکانیان بدەنێ(حەلاڵن بۆتان)، ئێوە دەبێ داوێنپاك بن داوێن پیس نەبن(بە ئاشکرا) و دۆستی ژێر بە ژێرتان نەبێ(بۆ داوێن پیسی)، وە ئەوەی بێباوەڕبێ بە ئیمان و شەریعەت ئەوە بێگومان کردەوەکانی هەڵدەوەشێتەوە وە لە ڕۆژی دواییدا یەکێکە لە ڕەنج بێبەران.

دیارە بە تایبەت خواستنی ئافرەتیان بە هەمان ئەو هەلومەرجەیە کە ئافرەتێکی مسوڵمانی دامێن پاك دەهێنیت، واتە چۆن بۆت درووستە کە ئافرەتی مسوڵمانی پاك بهێنیت کە زینای نەکردبێت و پاکوبێگەرد بێت، ئەوانیش هەر بەم شێوەن، واتە ئەو ئافەرتە گاوروجوولەکانە ناگرێتەوە کە بە زینا فێرن و هەر ڕۆژەی لە باخەڵی کەسێکدان، بەڵکوو ئەبێت ئەوانە بن کە قەراری زیناو دەستبازی لە غەیرەز مێردی خۆیان لەگەڵ کەسی تردا ئەنجام نەدەن. دیارە دیسان مەرجی تر لێرە دێتە پێشێ ئەویش ئەگەر ئەو ئافرەتانەی ئەوان کە دەیانهێنێت لەوانە نەبن کە دژایەتی خواو پێغەمبەر دەکەن، چونکە خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿لا تَجِدُ قَوْماً يُؤْمِنُونَ بِاللَّهِ وَالْيَوْمِ الْآخِرِ يُوَادُّونَ مَنْ حَادَّ اللَّهَ وَرَسُولَهُ﴾ (المجادلة: 22). (پێشتر ڕاڤەکراوە)

**سێیەم: گفتوگۆو چاکەکردن و لە خوا پاڕانەوە بۆیان کە ڕاستە ڕێ بن و ڕێنما بن درووستە:**

هەروەها لەو کارانەی کە دژ نین لەگەڵ ئەسڵی بەریبوون لە بێباوەڕان بریتییە لەگفتۆگۆکردن لەگەڵ ئەو **بێباوەڕانەی کە خاوەن بەڵێنن لەگەڵ مسوڵمانانو لەوانەی کە لە موعاهید و زیممی و ئەمان پێدراوانن، وەك خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿لا يَنْهَاكُمُ اللَّهُ عَنِ الَّذِينَ لَمْ يُقَاتِلُوكُمْ فِي الدِّينِ وَلَمْ يُخْرِجُوكُمْ مِنْ دِيَارِكُمْ أَنْ تَبَرُّوهُمْ وَتُقْسِطُوا إِلَيْهِمْ إِنَّ اللَّهَ يُحِبُّ الْمُقْسِطِينَ﴾ (الممتحنة: 8) . واتە: خوا ڕێتان لێ ناگرێ لەگەڵ ئەوانەی کە جەنگیان لەگەڵ نەکردوون لەسەر ئەم دینە وە دەریان نەکردوون لە جێگەو شوێنەکانتان کە چاکەیان لەگەڵدا بکەن، وە دادیان لەگەڵ بنوێنن بەڕاستی خوا ئەوانەی خۆش دەوێ کە دادگەرن. شتێ لەو چاکانەی کە درووستە لەگەڵیاندا پەیڕو بکرێت بریتییە لە سەردانی کردنی نەخۆشیان و شوێن تەرم کەوتنیان و ڕازی بوون بە دیارییان و پیرۆزبایی کردن لە**

خۆشیان و سەرخۆشی کردنیان و یارمەتی هەژارانیان و هاموشۆکردنیان و ڕازی بوون بۆ داوەتەکانیان و دوعاکردن بۆ ڕێنمابوون و گەڕانەوەیان بۆ لای ئیسلام، ئەمانەش قسەیەکن کە مسوڵمانان لەسەری کۆکن.

دیارە ئەمانەی کە گوتراشن چەند شتێکیان لێ پوخت دەبێتەوە:

**1. پاڕانەوە بۆ ئەوەی هیدایەت و ڕێنما بن:**

ئەمە هەتا ئەگەر بێباوەڕی موحارییبیش بن هەر درووستە کە دوعای هیدایەتیان بۆ بکرێت! چونکە پێغەمبەری خوا "صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وسَلَّم" دوعای خێری بۆ ئەهلی تاییف کرد لە کاتێ کە ئەوان زۆر نامەردانە ڕووبەڕووی ڕەحمەت و بەزەیی پێغەمبەر "صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وسَلَّم" بوونەوە، سەرباری ئەمە هەندەیان ئەزیەت پێ گەیاند و بەردەبارانیان کرد تا خوێن پێڵاوەکانی لێ پڕ کردن! کەچی دەیفەرموو: (اللَّهُمَّ اهْدِي قَوْمي فَإِنَّهُمْ لاَ يَعْلَمُون). واتە: خودایە لە گەلی من خۆش بە، چون نازانن. یان کاتێ کە ئەبووهوڕەیرە داوای لە پێغەمبەر "صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وسَلَّم" کرد کە دایکی بێباوەڕەو دوعای خێری بۆ بکە تا هیدایەت وەرگرێت، پێغەمبەریش "صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وسَلَّم" فەرمووی: «اللَّهُمَّ اهْدِ أُمَّ أَبِي هُرَيْرَةَ» (مسلم وأحمد). واتە: خودایە ڕێنمایی دایکی ئەبووهوڕەیرە بکەیت. هەروەها لە سەحیحی بوخاریشدا هاتووە لە "ئەبی هورەیرە" (خوا لێی ڕازی بێت)؛ کەوا کاتێ توفەیل و هاوڕێکانی کە هاتنە خزمەت پێغەمبەر "صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وسَلَّم" و توفەیڵ گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا "صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وسَلَّم" خەڵکی(دەوس) کافر بوونەتەوە دوعای هیدایەتییان بۆ بکە، هاوڕێکانی گوتیان: دەوس تازە بە فەتارەت چوو! پێغەمبەریش "صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وسَلَّم" فەرمووی : «اللَّهُمَّ اهْدِ دَوْساً وَائْتِ بِهِمْ» (البخاري ومسلم وأحمد)) (دەوس: تیرەی ئەبووهوڕەیرە بوو). واتە: هیدایەتی قەومی دەوس بدەیت و بیانهێنیتە نێو بڕوادارنەوە. هەروەها لە تیرموزیشدا هاتووە کەوا پێغەمبەری خوا "صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وسَلَّم" دوعای بۆ سەقیف کردووە دەیفەرموو: «اللَّهُمَّ اهْدِ ثَقِيفاً». واتە: خودایە هیدایەتی سەقیف بدەیت. ئەمەش کاتێك بوو کە بێباوەڕەکانیان لە دوای فەتحی مەککە خۆیان لێ قاییم کردبوو و موسوڵمانان نەیاندەتوانی کە فەتحی تاییف بکەن، پێغەمبەریش "صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وسَلَّم" لە بریتی ئەمە دوعای هیدایەتی بۆ کردن! پاشان ئەوان مسوڵمان بوون و هاتنە مەدینە.. بەڵام لەگەڵ هەموو ئەمانە درووستە کە دوعای شەڕو لە ناوچوون بۆ ئەوکسانە بکەیت کە کەللە ڕەق و دوژمنی سەرسەختن بە ئیسلام. هەروەك ئاشکرایە کە پێغەمبەری خوا "صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وَعَلَى

آلِهِ وسَلَّم" زۆر جاران دوعای لە ناوچوونی بۆ کەسانێك کردووە، لە دواییا دوعاکەی لێ گیرا بوونەو ئەوانیش بە فەتارەت چوونە ! !

**2. دیاری پێدان و وەرگرتن لێیان:**

هەروەك لە سەحیحی بوخاریدا هاتووە کەوا پێغەمبەری خوا "صَلّی اللهُ عَلَیْهِ وَعَلَی آلِهِ وسَلَّم" رۆژێك قوماشێکی ئاوریشمی بەخشی بە "عومەری کوڕی خەتتاب" (خوا لێی ڕازی بێت)؛ عومەریش فەرمووی: ئەی پێغەمبەری خوا "صَلّی اللهُ عَلَیْهِ وَعَلَی آلِهِ وسَلَّم" تۆ ڕقت لە ئاوریشمەو دەیبەخشیت بە من؟ پێغەمبەریش "صَلّی اللهُ عَلَیْهِ وَعَلَی آلِهِ وسَلَّم" فەرمووی: ئەی عومەر من بۆ ئەوەم پێ نەدایت کە تۆ بیپۆشیت بەڵکوو بۆیە پێم دایت تاکوو بیدەیت بە ژنەکانت، عومەریش وەریگرت و دای بە موشریکێکی مەککە، ئەمەش بەڵگەیە کەوا دروستە کەوا شتێ بکەیت بە دیاری بۆ بێباوەڕان کە بۆ مسوڵمانان دروست نەبێت بەکاریان بهێنێت. یان دەبینین کەوا پێغەمبەری خوا "صَلّی اللهُ عَلَیْهِ وَعَلَی آلِهِ وسَلَّم" دیاری لە هەردوو (مقوقس) – ابن خزيمة وأبو نعيم – وەرگرتووە.، یاخود مەڕێکی بە دیاری لە ئافرەتە جوولەکەکەی خەیبەر وەرگرتووە. ئەم چیرۆکەش لە (بوخاری کە لە ئەنەسەوە گێڕدراوەتەوە هاتووە).

**3. سەردانی کردنی نەخۆشان:**

هەروەك لە سەحیحی بوخاریدا کە لە ئەنەسەوە گێڕدراوەتەوە هاتووە کەوا منداڵێکی جوولەکە کە خزمەتکاری **پێغەمبەر بوو "صَلّی اللهُ عَلَیْهِ وَعَلَی آلِهِ وسَلَّم" نەخۆش دەکەوێت، پێغەمبەریش "صَلّی اللهُ عَلَیْهِ وَعَلَی آلِهِ وسَلَّم" سەردانی دەکات و دەچێتە پشت سەری و پێی دەفەرموێت: (مسوڵمان بە !) ئەویش سەیری باوکی دەکات کە لەوێ دەبێت ، باوکیشی دەڵێت: بە گوێی باوکی قاسم بکە، ئەویش مسوڵمان دەبێت و دەمرێت! ! پاشان پێغەمبەری خوا "صَلّی اللهُ عَلَیْهِ وَعَلَی آلِهِ وسَلَّم" فەرمووی: «الْحَمْدُ لِلَّهِ الَّذِي أَنْقَذَهُ بِي مِنَ النَّارِ» (رواه ابوداود عن انس "رضي الله عنهما"). واتە: سوپاس بۆ خوا کە لە ئاگری دۆزەخی نەجات دا. یاخود هەمدیس لە سەحیحی بوخاریدا هاتووە کەوا کاتێ کە ئەبووتاڵیبی مامی پێغەمبەر "صَلّی اللهُ عَلَیْهِ وَعَلَی آلِهِ وسَلَّم" دەکەوێتە جێگە پێغەمبەریش "صَلّی اللهُ عَلَیْهِ وَعَلَی آلِهِ وسَلَّم" بەردەوام داوای لە مامی دەکرد کە شایەتی بێنێ و ببێتە مسوڵمان، ئەبووجەهلیش دەیگوت:**

ئەبووتالێب ئەوە خەریکە لە سەر ئایینی عەبدولموتەلێب پاشگەز ببیتەوە؟! !ئەویش دەیگوت بەڵکوو لە سەر ئایینی عەبدولموتەلێبیم، بەم حاڵە مایەوە تاکوو دەمرێت و بە بێباوەڕی گیان ئەدات!! (رواه مسلم) ئەمەش لەمڕووەوە بەڵگەیە کە درووستە سەردانی نەخۆشی بێباوەڕان بکەیت.

## 4. خێر و چاکەکردن لەگەڵیان:

ئەمەش دەقێکی ئاشکرای قورئانە کە دەفەرموێت: ﴿لَيْسَ عَلَيْكَ هُدَاهُمْ وَلَكِنَّ اللَّهَ يَهْدِي مَنْ يَشَاءُ وَمَا تُنْفِقُوا مِنْ خَيْرٍ فَلِأَنْفُسِكُمْ وَمَا تُنْفِقُونَ إِلَّا ابْتِغَاءَ وَجْهِ اللَّهِ وَمَا تُنْفِقُوا مِنْ خَيْرٍ يُوَفَّ إِلَيْكُمْ وَأَنْتُمْ لا تُظْلَمُونَ﴾ (البقرة: 272). واتە: لەسەرتۆ نییە(ئەی موحەممەد "صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وسَلَّم") ڕێنموونیی و موسوڵمان کردنی خەڵکی، بەڵکوو خوا هەرکەسێکی بوێ هیدایەتی دەدات وە ئەوەی بەختی دەکەن لە دارایی(چاکە) ئەوە (قازانجەکەی) بۆ خۆتانە، ئێوە هیچ بەخت ناکەن مەگەر بۆ ڕەزای خوا نەبێ، وە ئەوەی(بەختی) دەکەن لەسامان (چاکە) ئەتان درێتەوەو ئێوە ستەمتان لێ ناکرێ.

"ئیبنوکەسیر" ڕەحمەتی خوای لێ بێت)؛

سەبارەت بەم ئایەتە دەفەرموێت: "ئەبووعەبدولڕەحمانی نەسائی" فەرموویەتی: کە "موحەمەدی کوڕی عەبدولسەلامی کوڕی عەبدولڕەحیم" ئەویش لە "فەریابی" ئەویش لە "سوفیان" ئەویش لە "ئەعمەش" ئەویش لە "جەعفەری کوڕی عەبباس" ئەویش لە "سەعیدی کوڕی جوبەیر" ئەویش لە "ئینوعەبباس" دەگێڕێتەوە کەوا: سەرەتا باوەڕدارن پێیان ناخۆش بوو کە خێر بەو خزمانەیان بکەن کەوا موشریك و بێباوەڕن، بەڵام خوای گەورە بە فەرمایشتی ﴿لَيْسَ عَلَيْكَ هُدَاهُمْ﴾ ڕێگەی پێیدان کە لەمەولا چاکەیان لەگەڵدا بکەن و دەستی یارمەتیان بۆ درێژ بکەن.

یاخود دەگێڕنەوە کەوا سەرەتا پێغەمبەری خوا "صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وسَلَّم" فەرمانی کردبوو کە تەنها خێر بە موسوڵمانان بکەن، بەڵام لە پاشان بە ئایەتی ﴿لَيْسَ عَلَيْكَ هُدَاهُمْ﴾ ئەم قەیدە هەڵگیراو ڕێگەدرا کە چاکە لەگەڵ بێباوەڕانیشا بکەن.

هەروەها لە بوخاری هاتووە کەوا "ئەسمای کچی ئەبووبەکری سەددیق" دێت بە پێغەمبەری خوا "صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وسَلَّم" دەفەرموێت: کەوا دایکە بێباوەڕەکەی دێتە ماڵیان ئایا ڕێگەی پێبدات؟ ئەویش فەرمووی: ئەبێ سیلەی ڕەحم بەجێ بگەینیت و ڕێگەشی پێ بدەیت. ئەمەش ئایەتی خوایە کە هانمان ئەدات دڵی دایکان و باوکان نەشکێنین. مەگەر لە سەر کوفر داوای خراپەمان لێ بکەن! وەك فەرمووی: ﴿وَإِنْ جَاهَدَاكَ عَلَى أَنْ تُشْرِكَ بِي مَا لَيْسَ لَكَ بِهِ عِلْمٌ فَلا تُطِعْهُمَا وَصَاحِبْهُمَا فِي الدُّنْيَا مَعْرُوفاً﴾ (لقمان: 15). واتە: وە ئەگەر (باوك و دایکت) ئەوپەڕی هەوڵیان دا لەگەڵت بۆ ئەوەی شتێ بکەیت بە هاوبەشی من کە هیچ زانیارییەکت پێی نییە، ئەوە گوێڕایەڵییان مەکە! بەڵام لە دونیادا زۆر بەچاکی هاوڕێیەتیان بکە.

**پوختەی هەموو ئەوانەی کە باسمان کرد:** ئەوەیە کەوا خێرو سەدەقەو چاکەکاری لەبەرامبەر بێباوەڕان درووستە.

وێڕای ئەمە هەتا چاکەکردن لەگەڵ ئاژەڵانیش مایەی ڕەزامەندی و پاداشتی خوایە، هەروەك پێغەمبەری خوا دەفەرموێت: «فِي كُلِّ كَبِدٍ رَطْبَةٍ اَجْر» (البخاري ومسلم وأبو داود وأحمد وغيرهم). واتە: لە چاکەکردن لەگەڵ هەر ئاژەڵێك پاداشت وەردەگریت.

**دوژمن و ناحەزانی ئیسلام بە شێوەیەکی سەرەکی کێن؟**

بۆ بۆ وەڵامی ئەم پرسیارە بە یەکەوە دەچینە خزمەت کتێبی بەرنامەو پرۆژەی کاری ئیسلامیی کە لە نووسینی **بەڕێز مامۆستا عەلی باپیرە؛ کە بەندە پێموایە زۆر بە جوانی لەم بوارەدا پێکاویەتی، بەڕێزی بەم چەشنەی خوارەوە دوژمنان و ناحەزانی ئیسلام پۆلێن دەکات و وەڵامی ئەم پرسیارەشمان دەداتەوە:**

**دەفەرموێت: بە شێوەیەکی سەرەکی دوژمن وناحەزانی خوا و ڕێباز و کۆمەڵەکەی دوو پێڕن:**

**یەکەم: بێبڕوایان (الكافرون):** کە بە خراپترین گیاندار و جانەوەر لە قەڵەم دەدرێن، هەروەك خوای گەورە دەفەرمووێ: ﴿إِنَّ شَرَّ الدَّوابِّ عِنْدَ اللهِ الَّذينَ كَفَرُوا فَهُمْ لاَ يُؤمِنُونَ﴾ (الانفال 55). واتە: خراپترین گیانەوەر لە لای خوا ئەوانەن کە بێباوەڕن و بڕوا بە خوا ناهێنن..

**ئینجا کافرانیش لە نێو خۆیاندا چەند جۆرێکن:**

**1. خاوەن کتێبەکان (اهل الكتاب):** کە جوولەکە (یهود) و دیان (نصرانی)ن کە خوای دادگەر لە بارەیانەوە فەرموویەتی: ﴿وَقَالَتِ الْيَهُودُ عُزَيْرٌ ابْنُ اللَّهِ وَقَالَتِ النَّصَارَى الْمَسِيحُ ابْنُ اللَّهِ ذَلِكَ قَوْلُهُمْ بِأَفْوَاهِهِمْ يُضَاهِئُونَ قَوْلَ الَّذِينَ كَفَرُوا مِنْ قَبْلُ قَاتَلَهُمُ اللَّهُ أَنَّى يُؤْفَكُونَ﴾ (التوبة:30). واتە: هێندێ لە جوولەکەکان دەیانگوت (عوزەیر) کوڕی خوایە و دیانەکانیش دەیانگوت مەسیح (عیسی) کوڕی خوایە، ئەمە قسەیەکە لە نێو خۆیاندا باوە، ئەم گوتەیەش هەمان گوتەی گاور و جولەکەکانی پێشووە، خوا بیانکوژێ چۆن دوور دەخرێنەوە لەڕێگەی ڕاست.

**2. هاو بەش پەیدا کەران (المشركون):** وەك دەفەرمووێ: ﴿إِنَّ الَّذِينَ كَفَرُوا مِنْ أَهْلِ الْكِتَابِ والْمُشْرِكِينَ فِي نَارِ جَهَنَّمَ خَالِدِينَ فِيهَا أُولَئِكَ هَمْ شَرُّ الْبَرِيَّةِ﴾ (البينة: 6). واتە: ئەوانەی کە بێبڕوان لە خاوەن کتێب و بوت پەرستەکان لە ئاگری دۆزەخا تیا ئەمێننەوە بەئێجگاری، ئەمانە خراپ ترینی هەموو دروست کراوێکن.

**3. ئاگرپەرست و ئەستێرە پەرستەکان (المجوس والصائبون):** هەروەك خوای گەورە دەفەرمووێ: ﴿إِنَّ الَّذِينَ آمَنُوا وَالَّذِينَ هَادُوا وَالصَّابِئِينَ وَالنَّصَارَى وَالْمَجُوسَ وَالَّذِينَ أَشْرَكُوا إِنَّ اللَّهَ يَفْصِلُ بَيْنَهُمْ يَوْمَ الْقِيَامَةِ إِنَّ اللَّهَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ شَهِيدٌ﴾ (الحج: 17). واتە: ئەوانەی کە بڕوادارن و ئەوانە کە جوولەکە و ئەستێرە پەرست و گاورو و ئاگر پەرستن، ئەوانەیش کە هاوبەشیان بۆ خوا داناوە، لە ڕۆژی دوایی خوای گەورە حوکمیان لە نێواندا دەکاو جیاوازیان لەنێواندا دەکات بەسەرخستنی ئەوانەی لە سەر هەقن و ڕێگای ڕاستیان گرتووە بەسەر ئەوانەی کە ڕێگای چەوتیان داوەتە بەر.

**3. خوا نەناسەکان (الملاحدة، الزنادقة):** ئەمانەش ئەوانەن، کە هەر ئەسڵەن بڕوایان بەهیچ شتێك نییە و خواش ناناسن و بێ دینن کە فیرعەون و نەمرووود لەم جۆرە بوو ون، هەروەك خوای گەورە لە بارەیانی فەرمووە: ﴿أَفَرَأَيْتَ مَنِ اتَّخَذَ إِلَهَهُ هَوَاهُ وَأَضَلَّهُ اللَّهُ عَلَى عِلْمٍ وَخَتَمَ عَلَى سَمْعِهِ وَقَلْبِهِ وَجَعَلَ عَلَى بَصَرِهِ غِشَاوَةً فَمَنْ يَهْدِيهِ مِنْ بَعْدِ اللَّهِ أَفَلا تَذَكَّرُونَ* وَقَالُوا مَا هِيَ إِلَّا حَيَاتُنَا الدُّنْيَا نَمُوتُ وَنَحْيَا وَمَا يُهْلِكُنَا إِلَّا الدَّهْرُ وَمَا لَهُمْ بِذَلِكَ مِنْ عِلْمٍ إِنْ هُمْ إِلَّا يَظُنُّونَ﴾

(الجاثـــية: 23-24). واتە: ئایا ئەی موحەممەد بینیت حاڵی ئەوکەسانەی کە وازی هێنا لە پەرستنی خوا و ئارەزووی خۆی کردۆتە خوا و لە ئەنجامدا خوای گەورە گومڕای کرد لەسەر زانستی ئەو کەسە (واتە: ئەو ئینسانەی کە لە ئیسلام شارەزا بوو بەڵام دوای ئیسلام نەکەوتبوو ئارەزووی خۆی کردبووە خوای خۆی) وە خوای گەورە مۆری خۆی نا بە گوێ و دڵیەوە و پەردەی خستە سەر چاوییەوە تا هیچ ئامۆژگارییەك كاری تێ نەکات، ئایا کێ هەیە کە ڕێنمایی بکات دوای ئەوەی کە خوا گومڕای کرد، ئایا (پەند)تان وەرگرت؟ وە ئەمانە دەیانگوت: هیچ ژیانێك نییە غەیری ژیانی دونیا، هێندێکمان دەمرین و هێندێکمان دەژین. بەتەنها ڕۆژگار ئێمە بەهیلاك ئەدات (ئەگەرنا هیچ دەستێکی خوای تیا نییە) بەڕاستی ئەمانە هیچ زانیارییەکیان دەربارەی (مردن و ژیان نییە) بەڵکوو (ئەوەی کە دەیلێن) گشتی خەیاڵ و گومانە.

**4. هەڵگەڕاوەکان (المرتدون):** ئەمانەش کەسانێکن کەسەردەمێك مسوڵمان بوون، یان خۆیان وا پیشان داوە کە مسوڵمانن بەڵام دوایی پاشگەز بوونەوە و بە هۆی گوتە و دەربڕینێك یان کردەوە و ڕەفتارێکی کافرانەوە لە ئایین دەرچوون. هەروەك خوای گەورە لە بارەیانی فەرمووە: ﴿إِنَّ الَّذِينَ ارْتَدُّوا عَلَى أَدْبَارِهِمْ مِنْ بَعْدِ مَا تَبَيَّنَ لَهُمُ الْهُدَى الشَّيْطَانُ سَوَّلَ لَهُمْ وَأَمْلَى لَهُمْ * ذَلِكَ بِأَنَّهُمْ قَالُوا لِلَّذِينَ كَرِهُوا مَا نَزَّلَ اللَّهُ سَنُطِيعُكُمْ فِي بَعْضِ الْأَمْرِ وَاللَّهُ يَعْلَمُ إِسْرَارَهُمْ﴾ (محمد: 25-26). واتە: ئەو کەسانەی کە پاشەو پاش بەرەو بێڕوایی دەگەڕێنەوە دوای ئەوەی کە ڕێگای ڕاستیان بۆ ڕوون بۆوە، ئەوانە شەیتان سەری لێشێواندوون و کارە خراپەکانی بۆ ئاسان کردووە، بەم جۆرە لەبەر ئەوەی دەیانگوت بەو کەسانەی ڕقیان لە قورئانی پیرۆزە ئێمە لە هەندێك کاردا بە گوێتان دەکەین، بەڕاستی خوا شارەزایە بە نهێنییەکانیان.

**دووەم: دووڕووەکان (المنافقون):** مونافیقەکان پیسترین جۆری دوژمن و ناحەزانی خوان، هەروەك خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿إِنَّ الْمُنَافِقِينَ فِي الدَّرْكِ الْأَسْفَلِ مِنَ النَّارِ وَلَنْ تَجِدَ لَهُمْ نَصِيرا﴾ (النساء: 145). واتە: بێگومان مونافیقەکان لە پلەی بنەوەی ئاگری دۆزەخن و هیچ یارمەتی دەریشیان بۆ شك نابەی.

**کەواتە: دەتوانین بڵێین دوژمن و ناحەزانی ئیسلام و مسوڵمانان بەگشتی ئەمانەن:**

1. مونافیقەکان.

2. جوولەکەکان.

3. دیانەکان.

4. هاوبەش پەیداکەرەکان.

5. زەندیق و بێ دین و خوانەناس و माددە پەرستەکان.

6. مەجووسییەکان.

7. صائبەکان.

8. هەڵگەڕاوەکان: کە لە وڵاتی ئێمە و سەرتاسەری جیهانی ئیسلامیش هەرکام لە کۆمۆنیستەکان و مارکسییەکان و ناسۆناڵیستەکان و دیموکڕاسییەکان، کە بە زاراوەی ئەمڕۆ سەرجەم (لائیك) و (سیکۆلاریست) یان (عەلمانی)یان پێ دەگوترێ، کەموزۆر دەچنە خانەی هەڵگەڕاوەکان (المرتدون). چونکە خاڵی هاوبەش (القاسم المشترك)ی هەموو ئەو پێڕو تاقمانە برتییە لە ڕازی نەبوونیان بەوە کە ئیسلام بەرنامەی هەمە لایەنی ژینی تاك و کۆمەڵ بێ، بەڵام بە مەرجێك ناکەونە بەر حوکمی هەڵگەڕاوەکان ئەگەر بە نەفامی یان بێ ئاگاییان بە ناچاری و ترس ئەم لایەنانەیان گرتبێ.

**شێوازی دەربڕینی دژایەتی بۆ بێباوەڕان لە مێژووی ئیسلامییدا**

بۆ وەڵامی ئەم خاڵەشیان هەر بەڕێز مامۆستا عەلی لە کتێبی کۆمەڵی خوادا شێوازی دەربڕینی دژایەتی لە ئیسلامدا لە دوو قۆناغی مەککەو مەدینەدا بەم جۆرەی خوارەوە ئاماژە پێ ئەدات:

**دەربڕینی دژایەتی بەرامبەر بێباوەڕانی لە قۆناغی مەککەدا**

قۆناغی مەککە واتە قۆناغی خۆ پەروەردەکردن و خۆ ڕاهێنان لە ئازار، ئەم قۆناغە قۆناغێك بوو کە مسوڵمانان تیایا لاواز و کەم ئەژمارو ژێر دەستە و لاواز بوون، بە جۆرێك نەدەوێران کە بە ئازادی و سەربەستی خوای خۆیان بپەرستن... لەوە دەترسان کە دوژمن لە پەناڕا بیانڕفێنێ و شوون بزریان بکەن.. بەڵام هاوشان لەگەڵ ئەم حاڵەتە نالەبارە هەڵوێستێکی بوێرو ئازایانەیان هەبوو لە ئاقار دوژمنان.. هەروەك خوای گەورە لە مەککە پێی فەرموون: ﴿قُلْ يَا أَيُّهَا الْكَافِرُونَ * لا أَعْبُدُ مَا تَعْبُدُونَ * وَلا أَنتُمْ عَابِدُونَ مَا أَعْبُدُ * وَلا أَنَا عَابِدٌ مَّا عَبَدتُّمْ * وَلا أَنتُمْ عَابِدُونَ مَا أَعْبُدُ * لَكُمْ دِينُكُمْ وَلِيَ دِينِ﴾ (سورة الكافرون). واتە: ئەی (موحەممەد) بڵێ بەبێ بڕواکان: ئەوەی کە ئێوە دەیپەرستن من نایپەرستم، وە ئێوەش ئەو خوایەی ناپەرستن کەمن دەیپەرستم، ئەو بەندایەتییە ناکەم کە ئێوە دەیکەن. وە ئێوەش ئەو بەندایەتییە ناکەن کە من دەیکەم، کەواتە ئایین و بەرنامەی خۆتان بۆ خۆتان و هی خۆشم بۆ خۆم. یان دەفەرمووێ: ﴿وَإِنْ كَذَّبُوكَ فَقُلْ لِي عَمَلِي وَلَكُمْ عَمَلُكُمْ أَنْتُمْ بَرِيئُونَ مِمَّا أَعْمَلُ وَأَنَا بَرِيءٌ مِمَّا تَعْمَلُونَ﴾ (يونس: 41). واتە: ئەگەر بێبڕواکان تۆیان بە درۆزانی تۆش پێیان بڵێ: کەواتە کاری خۆم بۆ خۆم، هی خۆشتان بۆ خۆتان، ئێوە بەرین لەو کارەی کە من دەیکەم، وە منیش بەریم لەوکارەی کە ئێوە دەیکەن.

**دەربڕینی دژایەتی بەرامبەر بێباوەڕان لە قۆناغی مەدینەدا**

دیسان بەڕێزی ئاماژە ئەدات و دەڵێت:

کۆمەڵگای مەدینە بۆ دەربڕینی دژایەتی دەکرێت بە سێ بەش:

**یەکەم: هاوتا دانەرەکان (المشرکون):**

شێوازەکانی دژایەتی دەربڕین بۆ هاوتاپەرستەکان بەم شێوەی خوارەوە بوو:

**دوای ئەوەی کە حکومەتی ئیسلامی لە مەدینە دروست بوو:**

لەم حاڵەتەدا خوای گەورە دەفەرمووێ: ﴿بَرَاءَةٌ مِنَ اللَّهِ وَرَسُولِهِ إِلَى الَّذِينَ عَاهَدْتُمْ مِنَ الْمُشْرِكِينَ﴾ (التوبة: 1). واتە: خوا و پێغەمبەریش لەو هاوتاپەرستانەی کە پەیمانیان لەگەڵ ئێوە بەستووە (شکاندوویانە) بەرییە و لێیان دوورە. یان دەفەرمووێ: ﴿وَقَاتِلُوا الْمُشْرِكِينَ كَافَّةً كَمَا يُقَاتِلُونَكُمْ كَافَّةً﴾ (التوبة: 36). واتە: شەڕی هاوتاپەرستەکان بکەن

بە هەموو هێزتان، هەروەك ئەوان شەڕی ئێوە دەکەن بە هەموو هێزیان.

بەکورتی وەك هەڵوێست کە لە بەردەم بێاوەڕانی مەدینە هەیانبوو بەکورتی ئەم چەند هەڵوێست و مامەڵە سەرکییەی خوارەوە بوو:

**1. ڕێ پێ نەدانیان بۆ سەردانی کردنی کەعبەی پیرۆز:**

هەروەك خوای گەورە دەفەرمووێ: ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا إِنَّمَا الْمُشْرِكُونَ نَجَسٌ فَلا يَقْرَبُوا الْمَسْجِدَ الْحَرَامَ بَعْدَ عَامِهِمْ هَذَا﴾ (التوبة: 28). واتە: ئەی بڕوادارینە هاوتاپەرستەکان پیس و چڵکنن و نابێ نزیکی کەعبەی پیرۆز بکەونەوە لە دوای ئەم ساڵەوە. (واتە ساڵی 9ی کۆچی).

**2. ڕێنەدان بەژن و ژن خواستن لەگەڵ ئەم هاوتا پەرستانە:**

هەروەك خوای گەورە دەفەرمووێ: ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا إِذَا جَاءَكُمُ الْمُؤْمِنَاتُ مُهَاجِرَاتٍ فَامْتَحِنُوهُنَّ اللَّهُ أَعْلَمُ بِإِيمَانِهِنَّ فَإِنْ عَلِمْتُمُوهُنَّ مُؤْمِنَاتٍ فَلا تَرْجِعُوهُنَّ إِلَى الْكُفَّارِ لا هُنَّ حِلٌّ لَهُمْ وَلا هُمْ يَحِلُّونَ لَهُنَّ﴾ (الممتحنة: 10) واتە: ئەی بڕوادارینە ئەگەر ئافرەتانی مسوڵمان کۆچیان کردوو هاتنە لاتان ئێوە تاقییان بکەنەوە، خوا ئاگادارە بە ئیمانەکەیان، ئەگەر زانیتان بەڕاستی بڕوایان هێناوە مەیانگەڕێننەوە لای بێڕواکان، چونکە نە ئافرەتانی بڕوادار بۆ بێبڕواکان حەڵاڵن نە ئەوانیش بۆ وان حەڵاڵن.

**3. ڕێنەدانی مسوڵمانان بەمانەوەیان لە نێو هاوتا پەرستەکان:**

هەروەك پێغەمبەری خوا "صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وسَلَّم" دەفەرمووێ: « أَنَا بَرِيءٌ مِنْ مُسْلِمٍ يُقِيمُ بَيْنَ أَظْهُرِ الْمُشْرِكِينَ» (رواه ابوداود). واتە: من بەریم لەو مسوڵمانەی کەوا لە نێو هاوتاپەرستان بمێنێتەوە.

**دووەم: خاوەن کتێبە ئاسمانییەکان (أهل الکتاب):**

هەروەك خوای گەورە دەفەرمووێ: ﴿قُلْ يَا أَهْلَ الْكِتَابِ لِمَ تَكْفُرُونَ بِآيَاتِ اللَّهِ وَاللَّهُ شَهِيدٌ عَلَى مَا تَعْمَلُونَ﴾ (آل عمران: 98). واتە: بلێ ئەی خاوەن کتێبەکان ئەوە بۆچی بڕوا بە ئایەتەکانی خوا ناکەن؟ خوا شایەتە بەو کردەوانەی کە دەیکەن.

**سێیەم: دوو ڕووەکان (المنافقون):**

خوای پەروەردگار دەربارەی دووڕووەکان دەفەرمووێ: ﴿هُمُ الْعَدُوُّ فَاحْذَرْهُمْ﴾ (المنافقون 4). واتە: دووڕووەکان دوژمنی ڕاستەقینەن ئاگاداریان بن. بۆیە مسوڵمانان زۆر دژایەتی خۆیان بۆ دەردەبرن.. ئەویش بە چەند شێوازێك بوو کە بریتی بوون لە:

**1. جیهاد کردن و غەرەزکێشان و دەبەریەك ڕاچوون لەگەڵیان:** هەروەك خوای گەورە دەفەرمووێ: ﴿يَا أَيُّهَا النَّبِيُّ جَاهِدِ الْكُفَّارَ وَالْمُنَافِقِينَ وَاغْلُظْ عَلَيْهِمْ...﴾ (التوبة: 73). واتە: ئەی پێغەمبەری خوا جیهاد بکە لەگەڵ بێبڕوا و دووڕوەکان و توند بە لەسەریان.

**2. نابێ لەکاتی مردنیان نوێژیان لەسەر بکرێ و سەردانی گۆڕیان بکرێ:** هەروەك خوای گەورە دەفەرمووێ: ﴿ولاتُصَلِّي عَلَى أَحَدٍ مِنْهُمْ مَاتَ أَبَداً ولاتَقُمْ عَلَى قَبرِهِ، إِنَّهُمْ كَفَرُوا بِاللهِ ورَسُولِهِ ومَاتُوا وهُمْ فَاسِقُونَ﴾ (التوبة: 84). واتە: بە هیچ جۆرێك نوێژیان لەسەر مەکەن کە مردن، وە لەسەر گۆڕیشیان مەوەستە، چونکە ئەوان نە بڕوایان بە خوا و نە بە پێغەمبەر نەبووە و بەبێ دینی مردوون.

**3. هیچ عوزریان لێ وەرناگیرێ لەکاتێ کە لە جیهاد بەپاش کەوتن:** هەروەك خوای گەورە دەفەرمووێ: ﴿فَإِنْ رَجَعَكَ اللهُ إِلى طَائِفَةٍ مِنْهُمْ فَاسْتَئْذَنُوكَ لِلْخُرُوجِ فَقُلْ لَنْ تخرُجُوا مَعِيَ أَبَداً ولَنْ تُقَاتِلُوا مَعِي عَدُوّاً إِنَّكُمْ رَضِيتُمْ بِالْقُعُودِ أَوَّلَ مَرَّةٍ فَاقْعُدُوا مَعَ الْخَالِفِينَ﴾ (التوبة: 83). واتە: کە گەڕایتەوە لای کۆمەڵێك لە دووڕووەکان، دێن و ئیزنت لێوەردەگرن کە لەگەڵ ئێوە بەشداری جیهاد بکەن، تۆش پێیان بڵێ: جارێکی تر لەگەڵ من دەرمەچوون و بەشداری شەڕمان

لەگەڵدا مەکەن. چونکە ئێوە لە پێشدا ڕازی بوون بەوەی کە دابنیشن و جیهاد نەکەن، کەواتە ئێستاش دابنیشن و لەگەڵ ئەوانەی کە لە جیهاد بە پاش کەوتوون.

4. نابێ داوای لێ خۆشبوونیان بۆ بکەیت: هەروەك خوای گەورە دەفەرمووێ: ﴿إِسْتَغْفِرْ لَهُمْ أَوْ لا تَسْتَغْفِرْ لَهُمْ إِنْ تَسْتَغْفِرْ لَهُمْ سَبْعِينَ مَرَّةً فَلَنْ يَغْفِرَ اللهُ لَهُمْ ذَلِكَ بِأَنَّهُمْ كَفَرُوا بِاللهِ ورَسُولِهِ واللهُ لايَهْدِي الْقَوْمَ الْفَاسِقِينَ﴾ (التوبة: 80).

واتە: ئەگەر داوای لێ خۆشبوونیان بۆ بکەیت یان نەکەیت، ئەگەر هەفتا جار داوای لێ خۆشبوونیان بۆ بکەیت ئەوا خوای گەورە بە هیچ جۆرێك لێیان خۆش نابێت، چونکە ئەوانە بێبڕوابوون بەرامبەر بە خوا و بە پێغەمبەر، خوای گەورەش ڕێنمایی کۆمەڵی بێدینان ناکات.

**پلەو حاڵەتەکانی دۆستایەتی کردنی بێباوەڕان:**

دەتوانین ئەو پلە و حاڵەتانە بۆ چوار پلە و جۆر دابەش بکەین:

**یەکەم: ئەو پلەو حاڵەتانەی کە مسوڵمان پێی دووچاری کوفرو هەڵگەڕانەوە دەبێ وەك:**

1. دۆستایەتی کردنی موتڵەق و هەمەلایەنە (التولي المطلق).

2. خۆشویستنیان لەبەر ئایینەکەیان (دوای گۆڕان و دەستکاری کردنیان).

3. فەرمانبەری کردنیان بە دڵ و قەناعەتەوە لە مەسەلەی یاسادانان (التشريع)دا.

4. بە خۆزگە خواستنی سەرکەوتنیان بەسەر مسوڵمانانادا.

5. قەناعەت هەبوون بەوەی کە وەك مسوڵمانانن و یەکسانن و مسوڵمانان هیچ ئیمتیازێکیان بەسەریاندا نییە.

6. خۆلێبردنە پێشیان و ماستاو بۆ گرتنەوەیان بۆ ڕازی کردنیان لە ڕووی خۆشەویستییەوە.

7. متمانە پێکردنیان و بە ئەمیندار دانانیان لە جیاتی مسوڵمانان.

**8.** هاوکاری و پشتیوانی کردنیان بۆ سەر خستنیان بەسەر مسوڵمانان دا (بەبێ فشار و ناچاری).

**9.** چاولێکردن و لاساکردنەوە و خۆ وێچواندنیان (التشبه بهم) بە موتڵەقی لە مەسەلەکانی عەقیدە و عیبادەتدا بە تایبەت ـ بەبێ فشار و زۆر و ناچار کردن.

**دووەم: ئەو پلە و حاڵەتانەی کە بە گوناهی گەورە لە قەڵەم دەدرێن بە مەرجێك ئەو شتانە بە حەڵاڵ نەزانێ: وەك:**

**1.** نەرمی بۆ نواندن و گەردن بۆ کەچ کردنیان (المداهنة والتذلل لهم).

**2.** کردنیان بە جێگای ڕاز و نیاز (اتخاذهم بطانة).

**3.** زیادە ڕۆییکردن لە گەورەگرتن و پایە بەرزکردنەوەیاندا.

**4.** چوونە ژێر ڕکێف و دەستەلاّت و حوکمڕانیانەوە بەبێ پێویستی و بەرژەوەندییەکی شەرعی.

**5.** بەشداریکردنیان لە کاروباری ئایینی و موناسەباتیاندا لە ڕووی (مجاملە)وە نەك قەناعەت و بڕوا، وە داوای لێبووردن کردن بۆ مردووەکانیان.

**6.** لاساکردنەوە و خۆوێچواندن (التشبه بهم) لە هەڵسوکەوت و دروشمەکانیان دا وەك جەژن و موناسەباتی مردن و لە دایك بوون، وەك بەناو جێژنی خۆشەویستی و سەری و ساڵ و کریسمس و ... هتد.

**7.** نیشتەجێ بوون لە نێوانیاندا بۆ کەسێك کە نەتوانێ دینداری خۆی ئاشکرا بکات و توانای کۆچکردن (هجرة)یشی هەبێت.

**8.** پیرۆزبایی لێکردنیان بە بۆنەی ئەو دروشمانەیانەوە کە تایبەتن پێیانەوە و دروشم و نیشانەی کوفرن.

**سێیەم: ئەو پلە و حاڵەتانەی کە گوناهی گچکە یان ناپەسند (مکروه)ن وەك:**

1. مەدح کردن و ستایش کردنیان بە بێ پاساودەر (مبرر)ێکی شەرعی، بەڵام نەك لەبەر ئاییینەکەیان.

2. هاوەڵایەتی کردن و لەگەڵ ژیانیان (بەبێ بەرژەوەندییەکی شەرعی).

3. موتمانەی موتڵەق پێ کردنیان.

4. کار لەلاکردنیان لەگەڵ بەسووك سەیر کردن و بێ ڕێزیدا.

5. خۆ وێچواندنیان لە بەرگ و پۆشاك و نەریتیان (کە تایبەتن بە کوفرەوە).

6. دوعا بۆ کردنیان بە تەندروستی و سەلامەتی و تەمەن درێژی و بەرقەراری، جگە لە دوعای هیدایەت.

**چوارەم: ئەو پلە و حاڵەتانەی کە بە دۆستایەتی (الموالات) دانانرێ و لە خانەی موباح بەو لاوە نییە: وەك:**

1. چاکەو دادگەری لەگەڵ کردنیان و خۆش ڕەفتاری لەگەڵیان، کە ئەمە سەرەڕای موباح بوون خێر و چاکەشە و خواش فەرمانی پێکردووە.

2. خێرکردن بە نەدارەکانیان و یارمەتی دانیان.

4. سەرخۆشی لێکردنیان بە شێوەیەکی شەرعی.

5. دیاری بۆ ناردن و دیاری لێقەبوڵ کردن.

6. وەڵام دانەوەی سەلامیان ئەگەر بەشێوەیەکی دروست نەك بە موخەننەتی سەلام بکەن.

7. مامەڵە و بازرگانی لەگەڵ کردنیان لە شتی موباح دا.

8. خانوو پێدانیان بەکرێ، بەمەرجێك بۆ خراپەی مسوڵمانان بە کاری نەهێنێ وەك بنکەی جاسوسی.

9. کار پێسپاردنیان بۆ مەبەستی موباح و شەرعی، لەگەڵ هەبوونی توانای دەرخستنی مسوڵمانەتیدا.

**10.** لە نێوانیاندا مانەوە و نیشتەجێ بوون بۆ مەبەستی شەرعی، لەگەڵ توانای دینداری کردندا بە ئاشکرا.

**11.** سەردان و هاموشۆیان بۆ مەبەستی شەرعی.

**12.** کەڵك لێ وەرگرتنیان لە بواری پیشەسازی و کاروباری دونیایی و ئەوەی ئەوان تێیدا شارەزاترن.

**13.** خواردنی خواردەمەنی یان ژن لێ هێنانیان، ئەگەر ئەهلی کتێب بن (لە جوولەکە و دیانەکان) لە کاتی پێویست دا.

**ئایا تۆبزیکردن لە مسوڵمان بۆ ڕازی کردنی بێباوەڕان لە کوێی دۆستایەتی بۆ بێباوەڕان جێگەی دەبێتەوە؟**

بێگومان بۆ بابابەکی مسوڵمان کە بە زۆر ملی بۆ داخوازییە کوفرییەکان کەچ بکەن لە سێ حاڵەت بەدەر نین:

**یەکەم**: لە ناوەڕۆك و ڕووخسار (الظاهر والباطن) بەکوفر ڕازی بێ: ئەمەش خاڵێکە لە هەرکەسێك دابێ ئەوا کافر دەبێ و لە ئیسلام دەردەچێ.

**دووەم**: لە ناوەڕۆك ڕازی بێ بە کوفر بەڵام بە ڕووخسار پێی ڕازی نەبێت: ئەمەش وەك خاڵی یەکەم هەر لە ئیسلام دەردەچێت و بە دووڕوو(منافق) ناو دەبرێ.

**سێیەم**: تەنها بە ڕوخسار بە کوفر ڕازی بێت بەڵام لە ناخەوە بێزت لێی بێ و بیبوغزێنی: ئەم خاڵەش دەکرێت بە دوو بەش:

**(1)** ئەگەر کەسێك بە زۆرە ملێ بەکوفر ڕازی بێ و یان نزیك بێ بیکوژن یان ئازاری بدەن نەوەك هەڕەشە، ئەوا لەم حاڵەتە ئەم ئینسانە بەکافر دانانرێ بە مەرجێك دڵی هەر پڕ بێت لە باوەڕ، بەڵگەش ئەمەیە کە کاتی خۆی (عەمماری کوڕی یاسر) خوا لێی ڕازی بێ ئازارێکی زۆریان داو زۆریان لێ کرد کە بە چاکە ناوی بوتەکانی قوڕەیشە کافرەکان بهێنێ، بەڵام کە هاتە لای پێغەمبەر "صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وسَلَّم" و هەواڵەکەی بۆ گێڕایەوە ئەویش پێی فەرموو: «فَإِنْ عَادُوا فَعُدْ... ». واتە: ئەگەر کافرەکان دووبارە ئازاریان دای ئەوا تۆش بە قسە ڕازیان بکە، بەڵام وا چاکترە مسوڵمانان لەم حاڵەتەدا دان بە خۆدا بگرن. ئەو دەمە خێری زیاتر بۆ دەنووسرێ، هەروەك کاتی

خۆی زۆر لە هاوەڵانی پێغەمبەر "صَلّی اللهُ عَلَیْهِ وَعَلَی آلِهِ وسَلَّم" دانیان بە خۆدا گرت... لە کاتێکدا کە ئازار دەدران، ئازاردانی (بیلالی حەبەشی)ش بەڵگەی ئەم ڕاستییەیە...

(2) بە ڕوخسار ڕازی بێت بە بیرڕوایان بە پێچەوانەی دڵەکانیان، ئەویش لەبەر چەند مەبەستێکی دونیایی یان خۆشویستنی گەورایەتی... هتد.

**بۆ ئەم حاڵە زانایان دوو ڕایان هەیە:**

هێندێك دەڵێن: ئەم حاڵە لە هەرکەسێکدا بێتەدی کافر دەبێ و لە ئیسلام دەردەچێ بەپێی ئەم ئایەتە: ﴿ذَلِكَ بِأَنَّهُمْ اسْتَحَبُّوا الْحَيَاةَ الدُّنْيَا عَلَى الآخِرةَ وأَنَ اللهَ لاَيَهْدِي الْقَوْمَ الْكَافِرِينَ﴾ (النحل: 107). واتە: بەم جۆرە ئەوان لەبەر ئەوەی ژیانی دونیایان بەسەر دوا ڕۆژدا خۆشتر ویست، بەڕاستی خوا ڕێنمای بێبڕوایان ناکات.

**هێندێك دەڵێن**: کافر نابێت بە کوفرێکی گەورە (الكفر الأكبر) بەڵام کوفرێکی بچووك (الكفر الاصغر)ی تیا دێتە دی کە ئەویش بریتییە لە گوناهە گەورەکان (الكبائر) کوفری بچوکیش ئینسان پێی لە ئیسلام ناشۆرێ.

**بۆ نابێ (ولاء) مان بۆ کافران هەبێ؟**

ئەو پەرچانەی کە ئیسلام دایناوە لەبەردەم مسوڵمانان و کردوویەتی بە ڕێگر لەوە کە دۆستایەتی بۆ بێباوەڕان دەربڕین لەبەر چەند شتێکە:

خوای گەورە هۆکارەکانمان پێ ڕادەگەیەنێت و باسیان دەکات کە چەندە ڕقیان لە بڕوادارنەو حەز بە چارەیان ناکەن، لەوانە دەفەرموێت:

1. ﴿وَدُّوا مَاعَنِتُّمْ﴾ (آل عمران: 118). واتە: بێ بڕواکان پێیان خۆشە کە تووشی ناخۆشی و چەرمە سەری بن.

2.﴿قَدْ بَدَتِ الْبَغْضَاءُ مِنْ أَفْوَاهِهِمْ وماَ تُخْفِي صُدُورُهُمْ أَكْبَرُ﴾ (آل عمران: 119). واتە: ڕق و کینەکانیان بەرامبەر بە

ئێوە ئاشکرا بوو، ئەوەیش کە لە دڵیانە زۆر ڕقێکی گەورەترە بەرامبەر بە ئێوە.

3. ﴿هَا أَنْتُمْ أُوْلاَءُ تُحِبُّونَهُمْ ولاَيُحِبُّونَكُمْ﴾ (آل عمران: 119). واتە: ئێوە کۆمەڵێکن ئەوانتان خۆش دەوێ بەڵام ئەوان ئێوەیان خۆش ناوێ.

4.﴿وإِذَا لَقُوكُمْ قَالُوا آمَنَّا وإِذَا خَلَوْ عَضُّوا عَلَيْكُمْ الأَنَامِلَ مِنَ الْغَيْضِ﴾ (آل عمران: 119). واتە: کاتێ دەگەنە لای ئێوە (بەدرۆ) دەڵێن ئێمە باوەڕمان هێناوە، بەڵام کاتێ لەلای ئێوە دەڕۆن لە ڕقان پەنجەتان لێ دەکرۆژن.

5. ﴿إِنْ تَمْسَسْكُمْ حَسَنَةٌ تَسُؤْهُمْ وإِنْ تُصِبْكُمْ سَيِّئَةٌ يَفْرَحوُا بِهَا﴾ (آل عمران: 120). واتە: ئەگەر شتێکی چاکتان پێگەیشت لە داخا نێو چاوانیان ڕەش هەڵدەگەڕێ، بەڵام ئەگەر دووچاری شتێکی ناخۆش بوون دڵیان پێ خۆش دەبێ.

6. ﴿وَلاَيَزَالوُنَ يُقَاتِلُونَكُمْ حَتَّى يَرُدُّوكُمْ عَنْ دِينِكُمْ﴾ (البقرة: 217). واتە: بەردەوام شەڕتان لەگەڵ دەکەن، تا هەڵتان گەڕێننەوە لە ئایینەکەتان.

7. ﴿لاَيَرْقُبوا فِيكُمْ إِلاًّ ولاَ ذِمَّةً﴾ (التوبە: 8). واتە: هیچ تێبینییەك ناکەن لەو پەیمان و بەڵێنەی کە لەگەڵ ئێوەياندا بەستووە.

## چارەنووس و دواڕۆژی ئەوانەی کە دۆستایەتی بۆ بێباوەڕان دەردەبڕن:

دەتوانین بە کورتی ئاماژە بە چارەنووس و ئاقیبەتی ئەوانە بدەین کە لە قورئان و فەرمایشتەکانی پێغەمبەر "صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وسَلَّم" ئاماژەی پێدراوە کە چەندە چارەنووسێکی تاڵ چاوەڕێیانە، لەوانە لە قورئاندا ئاماژەیان پێ ئەدات و دەفەرموێت:

(1) ﴿يَا ويْلَتَى لَيْتَنِي لَمْ أَتَّخِذْ فُلاَنَاً خَلِيلاً، لَقَدْ أَضَلَّنِي عَنِ الذِّكْرِ بَعْدَ إِذْ جَاءَنِي وكَانَ الشَّيطَانُ لِلإِنْسَانِ خَذُولاً﴾ (الفرقان: 28–29). واتە: ئەی قوڕ بەسەرخۆم بریا فلانە کەسم نەکردبا بە هاوڕێی خۆم، بەڕاستی منی گومڕا کرد

لە یادی خوا دوای ئەوەی کە فەرمانم پێکرابوو کە یادی خوا بکەم.

(2) ﴿الأَخِلاَّءُ يَوْمَئِذٍ بَعْضُهُمْ لِبَعْضٍ عَدُوٌّ اِلاَّ الْمُتَّقِينَ﴾ (الزخرف: 68). واتە: لە ڕۆژی دوایی هاوڕێیان هێندێك دوژمنی هێندێکیانن، تەنها پارێزکاران نەبن لە گوناه.

(3) ﴿هَذا فَوْجٌ مُقْتَحِمٌ مَعَكُمْ لاَ مَرْحَباً بِهِمْ إِنَّهُمْ صَالُواْ النَّارِ، قَالُوا بَلْ أَنْتُمْ لاَمَرْحَباً بِكُمْ أَنْتُمْ قَدَّمْـــتُمُوهُ لَنَا فَبِئْسَ الْقَرارُ، قَالُوا رَبَّنا مَنْ قَدَّمَ لَنَا هَذَا فَزِدْهُ عَذَاباً ضِعْفاً فِي النَّارِ﴾. (ص: 59-61). واتە: وا پۆل پۆل دەهێنرێنە ناو ئاگر.. (هەواڵی هێنانی پۆڵی دووەم دەدرێتە پۆلی یەکەم، جا ئایەتەکە دەڵێ): ئەمەش دەستەیەکە لەگەڵ ئێوە دێن (بۆ ناو دۆزەخ، واتە: بە زاڵ و سەرۆکەکان دەگوترێ، ئەوانیش وەڵام دەدەنەوە و دەڵێن): هەی بەخێر نێن، ئەوانە بەهۆی کردەوەکانیان بۆ ناو ئاگر دێن (پۆلی دووەمیش دەڵێن): بەڵکو ئێوە بە خێر نێن، ئێوە ئێمەتان تووشی ئەم سزایە کردووە کە قەرارگەیەکی نا هەموارە (ئنجا هەموو پێکەوە دەڵێن): خوایە هەرچی ئەو سزایەی بۆ ئێمە پێش خست (بووە هۆی ئەوەی ئێمە تووشی ببین) دوو چەندانە سزایەکی بۆ زاد بکە لەم ئاگرە.

هەروەها لە فەرمایشتەکانی پێغەمبەریش "صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وسَلَّم" ئاماژە بە چارەنووس و ئاقیبەتیان دراوە دەفەرموێت:

(1) «الْمرْءُ مَعَ مَنْ أَحَبَّ» (رواه مسلم). واتە: ئادەمیزاد لە دونیا لە گەڵ کێ دابێ و کێی خۆش بووێ لە دوا ڕۆژا لەگەڵ ئەو حەشر دەکرێ.

(2)«الرَّجُلُ عَلَى دِينِ خَلِيلِهِ» (رواه ابوداود). واتە: پیاو لەسەر ئاییینی هاوڕێکەیەتی.

### پاداشتی ئەوانەی کەوا دۆستایەتییان بۆ خوا دەربڕیوە:

بێ گومان ئەوانەی کە دۆستایەتییان بۆ خوا دەربڕیوەو لە ژیانیاندا بەجێ گەیاندووە، ئاقیبەت و چارەنووسێکی ڕۆشنیان لە پێشە، وەك خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿أَلا إِنَّ أَوْلِيَاءَ اللهِ لاَ خَوْفٌ عَلَيْهِمْ ولاَهُمْ يَحْزَنُونَ، أَلَّذينَ آمَنُوا وكَانُوا يَتَّقُونَ﴾ (یونس 62-63). واتە: بەڕاستی دۆستەکانی خوا ئەوانەن کە نەترسیان لەسەرە و نە

خەمباریشن، ئەوانیش ئەو کەسانەن کە بڕوایان هێناوە و بە تەنها لە خوا دەترسن و پارێزکار دەبن.

هەروەها پێغەمبەری خوداش "صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وسَلَّم" دەفەرمووێ: «إنَّ مِنْ عِبَادِ اللهِ لأُناسَاً ماهُمْ بِأَنْبِيَاءِ ولاشُهَداءِ، ويَغْبِطُهُمْ الأَنْبياءُ والشُّهَداءُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ، قَالوا: يا رَسُولَ اللهِ تُخبِرُنا مَنْ هُمْ؟ قَال: هُمْ قَومٌ تَحابُّوا بِروحِ اللهِ...» (رواه الترمذي). واتە: بەندەکانی خوا چەند کەسێکن کە نەپێغەمبەران و نە شەهیدانن، بەڵکوو لەم ڕۆژەدا پێغەمبەران وشەهیدان خۆزگەیان پێ دەخوازن، ئەوانیش گوتیان: ئەوانە کێن ئەی پێغەمبەری خوا؟ ئەویش فەرمووی: ئەوانە کەسانێکن کە لەبەرخاتری خوا یەکتریان خۆش دەوێ.

هەروەها دەفەرمووێ خوای پەروەردگار لە ڕۆژی دوایی دەفەرمووێ: «المُتَحَابُّونَ فِي جَلالِي لَهُم مَنَابِرُ مِنْ نُورٍ يَغْبِطُهُمُ النَّبِيُّونَ والشُّهَداءِ» (رواه الترمذي). واتە: ئەوانەی لە پێناو من یەکتریان خۆش دەوێ بۆیان هەیە لە چەند مافورێکی دروەشاوە و پرشنگدار کە پێغەمبەران و شەهیدان دەورەیان لێ ئەدەن.

## شێوازەکانی ڕازی بوون بە کوفر

شێوازی ڕازی بوو بە کوفر زۆر شێوازو چەشنی هەیە، سەرەکی ترینیان بریتییە لە:

1. بەکافر لە قەڵەم نەدانی کافرەکان: چ بێباوەڕ (ملحد) و چ پاشگەز بوو (مرتد) و چ هاوبەش پەیداکەر (مشرك) بێت. یان گومانی لە کوفری کافرێك هەبێت ئەمەش دەقێکی شەرعییە کە دەڵێ: (مَنْ شَكَّ فِي كُفْرِ كَافِرٍ فَهُوَ كَافِر). واتە: (هەر کەسێکی گومانی لە کوفری کافرێك هەبێ کافرە) یان ئەگەر یەکێك بە بەڵگە دیار بوو کە کافرە، ئەوا دروست نییە تۆ بە کافری نەزانیت.

2. دۆستایەتی کردنی کافران و ڕازی بوون بە ڕێبازەکانیان: (هەرکەسێك کافران بکات بە دۆست و هاوڕێی خۆی و ڕێبازەکانی پێ بەکەڵك بێ، ئەوا بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە بە کوفر ڕازییە.

**هەروەها سەبارەت بە شێوازەکانی ڕازی نەبوون بەئیسلامیش** چەند جۆرو چەشنێکی هەیە سەرەکی ترینیان

**بریتییە لە:**

**1. گاڵتەکردن بە شتێکی زانراو لە ئیسلام:** وەك گاڵتەکردن بە خوا و بە پێغەمبەر و بە کتێبە پیرۆزەکان و بە بڕواداران... یان بە چەند دروشمێکی ئیسلامی، وەك ڕیشی مسوڵمانان یان سواکێك یان لەچکی ئافرەتێك...هتد. هەروەك خوای گەورە دەفەرموویێ: ﴿وَلَئِنْ سَأَلْتَهُمْ لَيَقُولُنَّ إِنَّمَا كُنَّا نَخُوضُ ونَلْعَبُ قُلْ أَبِاللهِ وآيَاتِهِ ورَسُولِه كُنْتُمْ تَسْتَهْزِؤُنَ، لاَتَعْتَذِرُوا قَدْ كَفَرْتم بْعَد إِيمَانِكُمْ﴾ (التوبة 65-66). واتە: ئەگەر پرسیاریان لێ بکەیت، دەڵێن ئێمە گەمە و گاڵتە دەکەین، تۆش پێیان بڵێ: چۆن ئێوە گاڵتە بە خوا و ئایەتەکانی و پێغەمبەرەکەی دەکەن؟!!، هیچ بیانوویەك مەهێننەوە، چونکە (تازە) کافر بوونەوە لە دوای ئەوەی باوەڕتان هێنا بوو.

**2. ڕق هەڵسان و تووڕە بوون لە کاتێ کە باسی ئیسلام و خوا پەرستی دەکرێ یان کەباسی پێغەمبەر** "صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وسَلَّم" **دەکرێ:** هەروەك خوای گەورە دەفەرموویێ: ﴿وَمَا يَجْحَدُ بِآيَاتِنَا إِلاَّ الْكَافِرُونَ﴾ (العنكبوت 47). واتە: هیچ کەسێك دڵی ڕەق نابێ بە ئایەتەکانی خوا تەنها کافرەکان نەبێ. یان دەفەرموویێ: ﴿وَإِذَا تُتْلَى عَلَيْهِمْ آيَاتُنَا بَيِّنَاتٍ تَعْرِفُ فِي وجُوهِ الَّذِينَ كَفَرُوا الْمُنْكَرَ﴾ (الحج: 72). واتە: کاتێك کەئایەتە ڕوونەکانی خوایان بۆ دەخوێنیتەوە، یەکسەر نێوچاوانی کافرەکان لە تاوانباریان بە دیار دەکەوێ.

### حاڵەتی دۆستایەتی و دژایەتی لە سەردەمی زێڕینی پێغەمبەران و ئیسلامدا

ئەگەر چاوێك بە حاڵەتی سەردەمی زێڕینی پێغەمبەران و کەڵەپیاوانی ئیسلامدا بخشێنین، ئەوا بێگومان هەڵوێستی زۆر جوامێرانەو مەردانەی پێغەمبەران و کەڵە پیاوانی ئیسلام لەو ڕۆژەدا دەبینین، دەبینین کە چۆن ئەسپی دینداریان بۆ ڕازی کردنی خواو دەربڕینی خۆشەویستی ڕاستەقینە بۆ ئایین و بەرنامەی خوا لە ژیانی زێڕینیاندا تاوداوە. هەتا ئەگەر کەسێکیان ببینیایە کە خەریکە هەستی دۆستایەتی لە ژیانیدا گڕووتینی خامۆشبێ و دائەمرکێتەوە، ئەوان هاتوون هەستی بەرپرسیارێتیان لە بەردەم ئایین و بەرنامەی خوادا لە دڵدا بووژاندۆتەوە، دەنا هەڵوێستێکی شەرعییان لە بەرامبەردا دەربڕیون.. چونکە خوا وای ڕاهێنابوون کە هەمیشە بەرژەوەندی خوا لە

سەرووی هەموو بەرژەوەندییەکانەوە حسێب بکەن:

**ئەگەر سەیری پیش ئیسلام بکەین:**

لەوانە:

1. ئەگەر چیرۆکی ئیبراهیم پێغەمبەر (علیه الصلاة والسلام) بخوێنینەوە لە ژیانی پەیامنێریی ئەودا وردبینەوە، ئەوە هەڵبەت هەڵوێستی زۆر جوامێرانەو مەردانەی لێ دەبینین کە چۆن وەلاء و بەراء لە ژیانیدا بۆ ڕازی کردنی خوا ڕەنگی دابووەوە.

بە تەنیا ڕووبەڕووی بێباوەڕان و موشریکانی ئەو سەردەمە دەبووەوە پێی دەفەرموون: ﴿إِنَّا بُرَآءُ مِنْكُمْ وَمِمَّا تَعْبُدُونَ مِنْ دُونِ اللَّهِ كَفَرْنَا بِكُمْ وَبَدَا بَيْنَنَا وَبَيْنَكُمُ الْعَدَاوَةُ وَالْبَغْضَاءُ أَبَداً حَتَّى تُؤْمِنُوا بِاللَّهِ وَحْدَهُ إِلَّا قَوْلَ إِبْرَاهِيمَ لِأَبِيهِ لَأَسْتَغْفِرَنَّ لَكَ وَمَا أَمْلِكُ لَكَ مِنَ اللَّهِ مِنْ شَيْءٍ﴾ (الممتحنة: 4). (لە پێشدا ڕاڤەکراوە)

یان دەبینین بە باوکی دەفەرموو: ﴿وَإِذْ قَالَ إِبْرَاهِيمُ لِأَبِيهِ آزَرَ أَتَتَّخِذُ أَصْنَاماً آلِهَةً إِنِّي أَرَاكَ وَقَوْمَكَ فِي ضَلَالٍ مُبِينٍ﴾ (الأنعام: 74). واتە: بیر لەو کاتە بکەوە کە ئیبراهیم بە ئازەری باوکی خۆی گوت: ئەتۆ بۆچی ئەو بتانە دەپەرستی؟ ئەمن تۆش و گەلەکەشت دەبینم لە ڕێ لاوداوە.

یان دەبینین لە بەردەمیاندا دەوەستێ و قامکی بۆ ئاسمان ڕا دەکێشێت وەك خوا دەفەرموێت: ﴿وَكَذَٰلِكَ نُرِي إِبْرَاهِيمَ مَلَكُوتَ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ وَلِيَكُونَ مِنَ الْمُوقِنِينَ * فَلَمَّا جَنَّ عَلَيْهِ اللَّيْلُ رَأَى كَوْكَبًا قَالَ هَذَا رَبِّي فَلَمَّا أَفَلَ قَالَ لا أُحِبُّ الآفِلِينَ * فَلَمَّا رَأَى الْقَمَرَ بَازِغًا قَالَ هَذَا رَبِّي فَلَمَّا أَفَلَ قَالَ لَئِن لَّمْ يَهْدِنِي رَبِّي لأكُونَنَّ مِنَ الْقَوْمِ الضَّالِّينَ * فَلَمَّا رَأَى الشَّمْسَ بَازِغَةً قَالَ هَذَا رَبِّي هَذَا أَكْبَرُ فَلَمَّا أَفَلَتْ قَالَ يَا قَوْمِ إِنِّي بَرِيءٌ مِّمَّا تُشْرِكُونَ * إِنِّي وَجَّهْتُ وَجْهِيَ لِلَّذِي فَطَرَ السَّمَاوَاتِ وَالأَرْضَ حَنِيفًا وَمَا أَنَاْ مِنَ الْمُشْرِكِينَ﴾ (الأنعام: 75-79). واتە: ئێمە نیشانی ئیبراهیممان دا دامودەزگای ئەم ئاسمان و زەمینە کە سەر بەکێیە، تا لە ڕیزی باوەڕدارە ڕاستەکان بێ. کە شەو بەسەرداهات و تاریك داهات، ئەستێرەیەکی بەدی کرد. گوتی: ئەمە پەروەردگارمە. هەر کەلەبەرچاو ئاوابوو، گوتی: هەرچی ئاوا ببێ خۆشم ناوێ! وەختێ کە دیتی مانگ هەڵات، گوتی: ئەمە پەروەردگارمە، کە ئەویش لە بەرچاو نەما، گوتی: ئەگەر پەروەردگارم ڕاستەقانی خۆی شارەزاییم پێ نەڵێ، منیش لە گومڕایان دەبم. کاتێ کە دیتی وا خۆر لەکەڵ

سەردەکەویّ، گوتی: ئەمە لەوانی تر مەزنترە، ڕەنگە پەروەردگارەکەی من هەر ئەوەبێ! کە خۆریش کەوتە خۆرنشین، گوتی: گەلۆ! من لەوکارەتان کە شەریکان بۆ خودای من دەناسن، بەرییم. وا من بە دڵپاکی ڕووم کردە ئەو کەسە کە ئاسمانان و زەمینی داهێناوەو لەوانەنیم شەریکی بۆ پەیدا دەکەن. ئیبڕاهیم پییغەمبەر ئەمە حاڵی بوو بۆیە خوای پەردەوەرگار هەمیشە هانی مسولّمانانی داوە کە شوێن خوا بە یەکزانینی ئیبڕاهیم بکەون، وەك دەفەرموێت: ﴿قَدْ كَانَتْ لَكُمْ أُسْوَةٌ حَسَنَةٌ فِي إِبْرَاهِيمَ وَالَّذِينَ مَعَهُ إِذْ قَالُوا لِقَوْمِهِمْ إِنَّا بُرَآءُ مِنْكُمْ وَمِمَّا تَعْبُدُونَ مِنْ دُونِ اللَّهِ كَفَرْنَا بِكُمْ وَبَدَا بَيْنَنَا وَبَيْنَكُمُ الْعَدَاوَةُ وَالْبَغْضَاءُ أَبَداً حَتَّى تُؤْمِنُوا بِاللَّهِ وَحْدَهُ﴾ (الممتحنة: 4). واتە: بەڕاستی بۆ ئێوە هەیە سەر مەشقێکی جوان و چاك لە ئیبراهیم و ئەوانەی لە گەڵیدا بوون کە بە گەلەکەی خۆیانیان وت بەڕاستی ئێمە بێزار و بەرین لە ئێوە وە لەو شتانەش کە دەیان پەرستن لە جیاتی خوا ئێمە باوەڕمان نی یە بە (ئایینی) ئێوە وە پەیدا بوو لە نێوان ئێمە و ئێوەدا دوژمنایەتی و کینە بۆ هەمیشە تا کاتێك کە بروا بەخوای تەنیا دەهێنن.

2. هەڵوێستی حەبیبی نەجار:

ئیمامی "ئبنوکەسیر" (ڕەحمەتی خوای لێ بێت)؛ لە تەفسیری ئایەتی: ﴿وَجَاءَ مِنْ أَقْصَى الْمَدِينَةِ رَجُلٌ يَسْعَى قَالَ يَا قَوْمِ اتَّبِعُوا الْمُرْسَلِينَ﴾ (يّــس: 20). دەفەرموێت: ئیبنو ئیسحاق و ئیبنوعەبباس و کەعبی ئەحبار و وەهەبی کوڕی مونەببەه، ئەڵێن: خەڵکی شار خەریك بوون کە هەر سێ پێغەمبەرە یەك لەدوا یەکەکەیان بکوژن، پیاوێکیش لە دووری شار کە ناوی حەبیب بوو ئەمە ئەبیستێ، یەکسەر بە ڕاکردن بۆ نوسرەت و سەرخستنی پێغەمبەرەکان لە دووری شار بە ڕاکردن دێت و پێیان دەڵێت: ﴿يَا قَوْمِ اتَّبِعُوا الْمُرْسَلِينَ * اتَّبِعُوا مَنْ لا يَسْأَلُكُمْ أَجْراً وَهُمْ مُهْتَدُونَ﴾ (يّــس: 20 – 21). واتە: وە لەوپەڕی شارەکەوە پیاوێك (حەبیبی نەجار) بەپەلە هات وتی ئەی گەلەکەم شوێن ئەم پێغەمبەرانە بکەون. شوێن کەسانێ بکەون داوای هیچ کرێ و پاداشتێکیان لێ ناکەن کە خۆشتان ڕێنموونیی کراون. ئەوانیش کابر دەگرن و دەیکوژن.

هەروەها "شەبیبی کوڕی بیشر" لە "عیکرِمە" ئەویش لە "ئیبنوعەبباس" دەگێڕێتەوە کە ئەم پیاوە ناوی "حەبیبی نەجارِ" بوو، بۆ سەرخستنی پێغەمبەرەکان دێت و بەرگریان لێ دەکات و پێیان دەڵێت: بزانن کە ﴿إِنِّي آمَنْتُ

بِرَبِّكُمْ فَاسْمَعُونِ﴾ (یـــس: 25). واتە: بەڕاستی من باوەڕم هێنا بە پەروەردگارتان و دە ئێوەش گوێتان لێبێ.

"قەتادە" دەڵێت: حەبیبی نەججاڕیان گرت و دەستان کرد بە بەردەباران کردنی، دەڵێت: ئەویش بەم حاڵەوە بوو کەچی هەر دەیفەرموو: خودایە لە قەوم و تیرەی من خۆش بیت؛ چونکە نازانن. تا بەم حاڵە لە بەردەبارانکردنی بەردەوام دەبن تاکوو دەمرێت!!

سەیرکەن چۆن لە پێناو سەرخستنی پێغەمبەرەکان سەری خۆی بەخت کردو بەڕائەتی لە دەژمنان کرد.

3. چیرۆکی ئەم پیاوەی کە لە ماڵی فیرعەون بوو و بەرگریشی لە موسا دەکرد:

ئەوەی کە تا ئێستا ئاشکرایە کە ئەم پیاوە قیبتی بوو لە خزم و خوێشی فیرعەونیش بوو، "سەددی" دەڵێت: ئامۆزای فیرعەون بوو، هەندێکیش دەڵێن: ئەوکەسە یەکێکبوو لەوانەی کە لەگەڵ موسا دەربازی بوو، هەروەها "ئیبنو جورەیج" ئەویش لە "ئبنوعەبباس" دەگێڕێتەوە کەوا لە خزم و کەسی فیرعەون؛ هەر ئەم پیاوەو ئاسیای خێزانی فیرعەون بڕوادار بوون، ئەم پیاوە ئیمانی خۆی شاردبووەوە، دەریشی نەدەخست تەنها ئەو کات و ساتە نەبێت کە فیرعەون گوتی: ﴿ذَرُونِي أَقْتُلْ مُوسَى﴾ (غافر: 26). واتە: لێم گەڕێن با موسا بکەژم. لەو کاتە ئەو بە دەنگ دێت و دەڵێت: چۆن پیاوێك دەکوژن: کە تەنها تاوانی ئەوەندەیە کە دەڵێت: پەروەردگارم خوایە، لە کاتێك کە ئەو بەڵگەی بۆ ئەم قسەیەشی هەیە؟ هەروەك قورئانیش لە ئایەتێکدا ئەم قسانەمان بۆ دەگوازێتەوە کە دەفەرموێت: ﴿وَقَالَ رَجُلٌ مُؤْمِنٌ مِنْ آلِ فِرْعَوْنَ يَكْتُمُ إِيمَانَهُ أَتَقْتُلُونَ رَجُلاً أَنْ يَقُولَ رَبِّيَ اللَّهُ وَقَدْ جَاءَكُمْ بِالْبَيِّنَاتِ مِنْ رَبِّكُمْ﴾ (غافر: 28). واتە: وەپیاوێکی باوەڕدار گوتی: لە کەس و کاری فیرعەون بوو کە باوەڕەکەی شاردبۆوە ئایا (چۆن) پیاوێك دەکوژن؟ لەبەر ئەوەی دەڵێ: خوا پەروەردگارمە کە بەڕاستی چەند بەڵگەو موعجیزەی ڕوونی لە پەروەردگارتانەوە بۆ هێناون. ئینجا بە دزی خۆ دەگەینێتە لای موساو پێی دەڵێت: ئاگاداربە کۆمەڵێ کەس پیلانت بۆ دەکێشن تا بتکوژن!! وەك خوای گەورە باس دەکات و دەفەرموێت: ﴿وَجَاءَ رَجُلٌ مِنْ أَقْصَى الْمَدِينَةِ يَسْعَى قَالَ يَا مُوسَى إِنَّ الْمَلَأَ يَأْتَمِرُونَ بِكَ لِيَقْتُلُوكَ فَاخْرُجْ إِنِّي لَكَ مِنَ النَّاصِحِينَ﴾ (القصص: 20). واتە: پیاوێك لەوپەڕی شارەوە بەهەڵەداوان گەیشتێ، ئەی موسا! سەر گەورەکان دەربارەی تۆ ڕاوێژدەکەن؛ گەڕەکیانە تۆ بکوژن. زوودەرکەوە، ئەمەت بەچاکە پێ دەڵێم.

سەیر بکەن چۆن بڕوادارانی ئەو ڕۆژە لە پێناو چەسپاندنی بیروباوڕی وەلاء و بەڕاء ئامادەبوونە ژیانی خۆیان بخەنە مەترسییەوە، هەرتا لە بەردەم زۆردارترینی کەسی سەر زەویش بێت کە فێرعەونە!

لەسەردەمی زێڕینی ئیسلامیدا:

خۆ ئەگەر سەیرێکی مێژووی ئیسلامیش بکەین و لە ژیانی زێڕینی بڕواداران وردبینەوە ئەوە دیسان نموونەگەلێکی زۆر نایاب و جوان لە ژیانیاندا دەخوێنینەوە.

1. "چیڕۆکی عاتەبی کوڕی ئەبی بەلْتەحە" گەورەی چیڕۆکەکانە لە مەڕ دۆستایەتی و دژایەتی، وەك لە پیشدا بە درێژی ڕوونمان کردەوە. لێرە زیاتری قەس لەسەر ناکەین.

2. ئەبووبەکر داوای ڕوو بەڕووبوونەوە لەگەڵ کوڕەکەی دەکات!

لە شەڕی بەدری گەورەدا "ئەبووبەکری سەددیق" (خوا لێی ڕازی بێت)؛ کە هێشتا عەبدولڕەحمانی کوڕی بێباوەڕ بوو، شوێن بە شوێن بە دوای کوڕەکەیەوە بوو و داوای ڕووبەڕووبونەوەی لیَ دەکرد!! بۆیە کاتێ کە لە ئاشتەوایی حودەیبە عەبدولڕەحمان بە باوکی دەڵێت: من لە شەڕی بەدر خۆم لە تۆ لا دەدا نەکا بکەویتە بەرامبەرم، توخوا ئێستا کە من بوومەتە مسوڵمان توخوا پێم نالێیت: بۆ ئەم ڕۆژە بەدوامەوە بوویت؟ ئەویش دەڵێت: بۆ ئەوەی بتکوژم!!!

ئەمەیە بیروباوەڕی ڕاستەقینەی "ئەبووبەکری سەددیق" (خوا لە خۆی و کوڕەکەی ڕازی بێت) لە دەرهەق دەربڕینی دۆستایەتی بۆ خواو پێغەمبەرەکەی و دژایەتیشی بۆ بێباوەڕان، جا هەتا ئەم بێباوەڕە کوڕیشی بێت!!

3. موسعەبی کوڕی عومەیر (خوا لێی ڕازی بێت)؛ لەگەڵ دایکی:

کاتێ کەوا سەحابی بەڕێز "موسعەبی کوڕی عومەیر" (خوا لێی ڕازی بێت)؛ گوێی لیَ دەبێت کەوا پێغەمبەری خوا "صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وسَلَّم" لە (دار الأرقم) داوا دەکات کە موسعەب ببێتە مسوڵمان، موسعەبیش دەچێتە (دار

الأرقم) و مسولْمان دەبێت، بەڵام موسعەب لە ترسی دایکی مسوڵمان بوونی خۆی ئاشكرا ناكات، چونكە دایكی كە ناوی ( خەنناسی كچی مالك) بوو، وە كەسایەتییەكی بەهێزی مەككە بوو، جگە لە موسعەب تێكڕای خەڵكی مەككە لە بەركەسایەتی و سام و شكۆی خەنناس دەوەستان و شەرمیان لێی دەكرد، بۆیە بۆ موسعەبیش زۆر قورس بوو ئەگەر ئیسلامەتییەكەی خۆی ئاشكرا بكردایە، بۆیە هەموو جار بە نهێنی دەچووە لای پێغەمبەر "صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وسَلَّم". ڕۆژێك "عوسمانی كوڕی تەڵحە" دەیبینێ كە موسعەب خەریكی نوێژە! بۆیە یەكسەر دەچێت و هەواڵەكە بە دایكی ڕادەگەیەنێت!! كاتێ كە دەگەڕێتەوە یەكسەر لە ماڵێدا بەندی دەكات!! بەردەوام لە لەماڵدا بەندكرابوو، تاكوو پێغەمبەری خوا "صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وسَلَّم" ئیزنی پێ ئەدات كە لە دەرفەتێكا ڕابكات بۆ حەبەشە، ئەویش دەرفەت دێنێ و ڕادەكات بۆ حەبەشە، پاشماوەیەك بە نهێنی دەگەڕێتەوە مەككە لە دوایی دەچێتەوە حەبەشە، كاتێ كە دەبیستێ كۆمەڵێك لە ئەنسارِ هاتوون بەیعەتیان بە پێغەمبەر "صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وسَلَّم" داوە، ئەویش یەكسەر دەگەڕێتەوە، بەڵام ئەمجارەیان دایكی پێی دەزانێت یەكسەر دەیگرێ و لای خۆی بەندی دەكاتەوە، موسعەبیش ئەو جارە پێی دەڵێت: دایكە ئەگەر بەردەوام بیت و لە زیندانێمدا بكەیت، ئەوە هەموو ئەوانەی كە داوای كۆمەكیان لێ دەكەم دێن و دەتكوژن! كاتێ كە دایكی دەبینی كە موسعەب لە سەر ئیسلامەتییەكەی خۆی هەر مكوڕە، ئەمجارە بەگریانەوە وازی لێ دەهێنێ و پێی دەڵێت: دەجا بڕۆ من چیتر دایكی تۆ نیم!!

موسعەبیش لێی نزیك دەكەوێتەوە پێی دەگوت: دایە گیان! من ئامۆژگاریت دەكەم كە شایەتی بدەو مسوڵمان بە، ئەویش پێی دەگوت: نایەمە نێو دینەكەتەوە كە لە دوایی خەڵكی گاڵتە بەبیروبۆچوون و ئەقڵم بكەن و بڵێن تێكچووە!!

بەم جۆرە موسعەب ئیسلامی بەسەر قسەی دایكیدا هەڵبژاردو پشتی لەو هەموو نازو نیعمەتەی دایكی كردو ژیانی دەربەدەرەی و قوڵەمەرگی بۆ خۆی هەڵبژارد!!

موسعەب لە پێش ئیسلامدا گەنجێكی تا بڵێی دەوڵەمەندو جوان و بەرچاو بوو لە مەككە، بەڵام خۆشەویستی ئیسلام و زیندوو كردنەوەی ئاقیدەی وەلاء و بەراء هێندە لە ژیانیدا ڕەنگی دابووەوە، تا بۆ ئیسلام هەرچی هەیبوو گۆڕیەوە پێی، بۆیە دەڵێن: كاتێ كە شەهید بوو كفنەكەی بەشی نەدەكرد، ئەگەر سەریان داپۆشتایە، بەشی قاچی

نەدەکرد، ئەگەر قاچیان داپۆشتایە بەشی سەری نەدەکرد..!! (هەزاران درووودو ڕەحمەت و ڕەزامەندی خوا بڕژێت بەسەر ئەو گەنجە جوانەی ئیسلام).

هەروەها لە دوای چینی سەحابەش (خوا لێیان ڕازی بێت)؛ کەڵەپیاوانی ئیسلام درێژەیان بە هەڵوێستە جوامێرییەکانی پێغەمبەران و پێغەمبەری ئیسلام و یارانی ئەدا، زۆر جوامێرانە وەلاء و بەڕائیان لە ژیاندا پەیڕەو دەکرد، لەوانە:

1. "عیززی کوڕی عەبدولسەلام" مەردانە لە بەردەم سەرکردەی وڵات دەوەستێتەوە:

"ساڵح ئەییوب"؛ کە ئەمیری شام بوو، لە بەر خیلاف لەگەڵ کوڕە مامەکانی تەنازولی لە هەندێ لە قەڵاکان کردبوو بۆ دیانەکان، "عیززی کوڕی عەبدولسەلام"یش کە ئەمەی بیست لە ڕۆژی هەینیدا ئەچێتە سەر مینبەر لە مزگەوتی "بەنی ئومەییە" لە دیمەشق وتارێك دەخوێنێتەوە دەڵێت: خودایە کاری ئەم ئوممەتە ڕاستەڕێبکە، ئەوانە سەر بەز بکە کە ئەهلی تاعەتی تۆن، ئەوانەش ڕیسوا بکە کە بێفەرمانی تۆ دەکەن، وا بکە کە فەرمان بەچاکەو ڕێگری لە خراپە لە نێو ئەو ئوممەتە بەر قەرار بێت. ئینجا فەتوایدا کە درووست نییە چەك بە دیانەکان بفرۆشرێت، ئەوانەی کە دێن لە دیمەشق چەك کۆ دەکەنەوە دەیکڕن.

"ساڵح" کە ئەمە دەبیستێ زۆر تووڕە دەبێت و "عیززی کوڕی عەبدولسەلام" دەخاتە کونجی زیندانەوە، پاشان "ساڵح" یەك لە دۆستەکانی خۆی دەنێرێتە لای و پێی دەڵێت: من داوا لە پێشەوا ساڵح دەکەم تا لە زیندان ڕزگارت ببێت، بەڵام یەك شتم لێت ئەوێت، ئەویش بێیت سەری "ساڵح" ماچ بکەیت و عوزری بۆ بهێنیتەوە! "عزز"یش فەرمووی، بڕۆ وازم لێ بهێنە، بەو خوایە من ڕازی نیم هەتا سوڵتان بێت سەرم ماچ بکات، چجای بگات بەوە کە من سەری ئەو ماچ بکەم، خوا بمبوورێت لەو گێژاوەی کە ئێوەی تێکەوتوون، بزانن کە من لە دۆڵێکم و ئێوەش لە دۆڵێکی تر.

"ساڵح" دەچێت بۆ چاو پێکەوتنی سەرکردەی دیانەکان و "عزز"یش لەگەڵ خۆی بە پەل بەستراوی دەبات و لە ژێر ڕەشەماڵێکا لە نزیك خۆی بەندی دەکات!! کاتێك کە "ساڵح" لە گەڵ دیانەکان دادەنیشێ، "عزز"یش لە ژێر خیوەتەکە قورئان دەخوێنێ و دەنگی بۆ ئەوان دەچێت!

"ساڵح" گوتی: دەزانن ئەوە کێیە کە دەنگی دێت و گوێتان لێیەتی؟

گوتیان: نەخێر!

گوتی: ئەوە گەورەترین قیسسیسی ئێمەیە!! نەیگوت: گەورەترین زانایای ئێمەیە، دەزانن کە بۆچی زیندانم کردووە؟ گوتیان: نەخێر! گوتی: چون فەتوای داوە کە نابێت چەك بەئێوە بفرۆشم!.

ئەوانیش گوتیان: بەو خوایە ئەگەر ئەوە قسسیسی ئێمە بوایە ئەوا قاچەکانمان بۆی دەشت و ئاوەکەیمان لە بەر پیرۆزی دەخواردەوە!!!

"سالح" بەم قسەیە زۆر تەریق دەبێتەوە و بە سەر خۆیدا دەشکێتەوە، بۆیە دەستبەجێ فەرمان دەدات کە "عززی کوڕی عەبدولسەلام" ئازاد بکەن!!

2. "ابن الحجر الهيتمي" (ڕەحمەتی خوای لێ بێت)؛ فەرموویەتی: کابرایەکی بەرگدروو چوو بۆ لای "سوفیانی سەوری"(ڕەحمەتی خوای لێ بێت)؛ پێی گوت، قوربان من جل و بەرگی سوڵتان دەدرووم، ئایا من لە ڕێزی یارمەتی دەرانی زاڵمان (اعوان الظلمة) دەژمێردرێم؟!! سوفیان فەرمووی: بەڵکوو تۆ خۆت لە ستەمکارانی، بەڵام یارمەتی دەرانی ستەمکاران (اعوان الظلمة)، ئەوانەن کە دەرزی و دەزووەکەت پێ دەفرۆشن؟!.

دیسان پرسیار لە (سوفیان) کرا دەربارەی زۆردارێك کە لە چۆڵاییەکدا خەریکی مردنە، ئایا قومە ئاوێکی پێبدەم؟ فەرمووی: نەخێر! پێی گوت: ئەی بمرێ؟ فەرمووی لێی گەڕێ بابمرێ؟!!

3. "شێخولئیسلام ئیبنوتەیمییە" (ڕەحمەتی خوای لێ بێت)؛ دەربارەی لەشکری تەتار دەفەرمووێت: ئەگەر منتان بینی لەگەڵ لەشکری تەتاردام و قورئانێکم لە بان سەری خۆم داناوە، ئەگەر منتان گرت یەکسەر بمکوژم! چونکە من بەم کارەم ژمارەی لەشکرەکەم زیاد کردووە!!

(بۆ ئاگاداریش لەشکری تەتار زۆربەیان نوێژکەر و قورئان خوێن و ڕیشدار و بەرسمێڵ کەر بوون) بەڵام چونکە یارمەتی (جەنگیز خان)یان دەدا کە پیاوێکی زاڵم و ستەمکاربوو بۆیە دروست نەبوو کە سەربازیی بۆ بکەن.

4. خوشکی "بیشرولحافی" (ڕەحمەتی خوای لێ بێت)؛ مافوورچن بوو ڕۆژێك هاتە خزمەت ئیمام ئەحمەد، پێی دەڵێت: هێندێ جار پاسەوانەکانی سوڵتان بەلامدا ڕەت دەبن و مەشخەڵێك ئاگریان پێیە، ئایا درووستە کە لەو کاتەدا من لەژێر ڕووناکی مەشخەڵەکانیان مافور بچنم؟! ئیمام ئەحمەدیش فەرمووی: بۆ تۆ لە ماڵی کێیت؟ ئەویش

گوتی لە ماڵی بیشرم، ئینجا ئیمام ئەحمەد پێی فەرموو: لەماڵتان وەرەعی ڕاستەقینە دەردەچێت، کەوابوو نەکەی لە ژێر ڕووناکی مەشخەڵەکانیان مافور بچنیت ! !

لێرەدا کۆتایی بەم باسە دەهێنین، هیوادارم توانیبێتم چەمکێك لە مانای وەلائـ و بەڕائم بە مسوڵمانانی هێژاو خۆشەویست بەخشیبێ و بەمەش ڕەزامەندی خوام مسۆگەر کردبێت.

سُبْحَانَكَ اللَّهُمَّ وَبِحَمْدِكَ نَشْهَدُ الاَّ اِلَهَ اِلاّ اَنْتَ نَسْتَغْفِرُكَ وَنَتُوبُ اِلَيْكَ

---

سەرچاوەکان:

1. الولاء والبراء في الإسلام   محمد بن سعيد القحطاني

2. الولاء والبراء في الإسلام:  أبو عبد الله عبد الرحمن بن عبد الخالق

3. الإيمان:  محمد نعيم ياسين

4. تفسير ابن كثير

4. بەرنامەی پرۆژەی کاری ئیسلامیی:  عەلی باپیر

5. کۆمەڵی خوا:     عەلی باپیر

6. پوختەی تەفسیری قورئان: موحەممەد مەلا ساڵح